# ڕۆژوو

ئازاد نجم الدین



| | |
|---|---|
| ناوی کتێب: | ڕۆژوو |
| نوسەر: | ئــازاد نجم الدين |
| نەخشەسازی ناوەوە | هەردی |
| بڵاوکردنەوەی: | نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر |
| خــــە ت: | نەوزاد کۆیی |
| بەرگ: | أمين مخـلص |
| نۆرە و ساڵی چاپ: | یەکەم ١٤٢٩ك – ٢٠٠٨ز |
| تـــــــیراژ: | ( ٢٠٠٠ ) دانە |

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی ١١٤٦ی ساڵی ٢٠٠٨

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر تونێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٢٢ ٥١ ٤٦٠ ٠٧٥٠ - ٩١ ٧٢ ١٣٨ ٠٧٧٠
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

# بسم الله الرحمن الرحيم

انَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ ونَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفِرُهُ، ونَعوذُ باللهِ مِنْ شُرورِ أنْفُسِنا ومِنْ سَيِّئاتِ أعْمالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ فَلا هادِيَ لَهُ. وأشْهَدُ أنْ لا الهَ إلا اللهُ وأشهَدُ أنَّ محمداً عَبدُهُ ورسُولُهُ. يا أيُّها الذينَ آمَنوا اتَّقُوا اللهَ حَقَّ تُقاتِهِ ولا تَمُوتُنَّ إلاّ وأنتُمْ مُسلِمونَ، يا أيُّها النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الذي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ واحِدةٍ وخَلَقَ مِنها زَوجَها وبَثَّ مِنهُما رِجَالاً كَثيراً ونِساءً واتَّقُوا اللهَ الذي تَساءَلُونَ بِهِ والارْحَامَ إنَّ اللهَ كانَ عليكُمْ رَقيبَاً، يا أيُّها الذينَ آمنوا اتقوا اللهَ وقُولوا قَولاً سَديداً، يُصلِحْ لَكُمْ أعمالَكُمْ ويَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ، وَمَنْ يُطعِ اللهَ ورسولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوزاً عَظيماً.

أمَّا بعدُ: فإنَّ أصدَقَ الحَديثِ كِتابُ اللهِ، وخَيرَ الهَدْيِ هَدْيُ محمدٍ صلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ وشَرَّ الامُورِ مُحْدَثاتُها، وكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ، وكُلَّ ضَلالةٍ فى النَّارِ.

# پێشەکی چاپی یەکەم

لەگەڵ خولانەوەی ساڵ رۆژووی رەمەزانیش دێتەوە، بە هاتنەوەی ئەویش خەڵکانێك دەگەڕێنەوە بۆ ئیسلام و سەرلەنوێ بە نوێژو رۆژووەکانیانەوە پابەند دەبنەوەو واز لە زۆر تاوان و گوناح و رەفتارو رەوشتی جاهیلیی دەهێنن، ئەمەش هەر چەندە نوقسانە بەڵام هەر جێی دڵخۆشییە..

پرسیار دەربارەی مەسەلەکانی نوێژو رۆژوو لەو پرسیارە زۆرانەن کە رووبەڕوو دەبنەوەو و پێویست بەوەڵام دانەوەدەکات. بۆیەبە باشم زانی زۆرینەی باسەکانی شەرع لە دوو توێی کتێبدا بخەمە بەردەستی برایان، تا هەر یەکەیان سەرچاوەیەکی وەڵامی پرسیارە شەرعیەکانی لە لا بێت، ئەمەی بەردەستی بەڕێزیشتان باسەکانی رۆژووە، هەوڵمداوە زۆرترین باسە سەرەکیەکان لە خۆ بگرێت، بەڵام بە تەئکید هەموو باسەکانی رۆژوو نین، چونکە هەموویان کتێبی قەبارە گەورەتریان دەوێت.

ئەمما دەربارەی شێوازی ئەم نووسینە، پێویستە چەند خاڵێك روون کەینەوە:

ـ هەموو زاراوەیەك یەکەجار راڤە کراوە، پاشان حوکمی شەرعیی چییە، ئینجا بەڵگە شەرعیەکەی لە قورئان و حەدیس، پاشان رای شەرعناسان دەربارەی، بۆ ئەوەی هەر کەس دەیخوێنێتەوە شارەزاییەکی سەرەتایی لە شەرعدا پەیدا کات، ئەمما ئەو کەسەی تاقەتی ئەو تەفسیلاتەی نییە بە کورتترین رستە و (**به خەتێکی جیاواز وەك ئەم خەتە، کە خەتی بەژێردا هاتووە**) رای پەسەند کراوم بۆ جیا کردۆتەوە، واتە ئەو راو بۆچوونەی بە دیدی من بەهێزترە بۆم دیاری کردووەبۆ ئەوەی ئەگەر متمانەی لەسەر دین و دینداری و زانیاری من هەبوو، ئەو کورت و موختەسەرە وەربگرێت، ئەگەر کەسێکیش ویستی بەڵگەکان و رای شەرعناسان بزانێت، ئەویشم بۆ روون کردۆتەوە، تا ئەگەر را و بۆچوونەکەی منی پێ پەسەند نەبوو، خۆی بتوانێت رایەکی تر وەرگرێت..

ـ بۆ توێژینەوەی حەدیسەکان، تا رای ئەلبانی رەحمەتیم دەربارەی سەحیحی و زەعیفی حەدیس دەست کەوتبێت نەچوومەتە سەر رای کەسی تر، چونکە پێم وا نییە کەس لەم سەردەمەی نێستای ئێمەدا لەو شارەزاتر بوو بێت، دەشزانم کە مەیدانی توێژینەوەی حەدیس بەرفراوانەو جێگای زۆری تری غەیری ئەلبانیشی تێدا بۆتەوە، بەلاّم کەس لەم سەردەمەداوەك ئەلبانی رەحمەتی ئیعتیرافی پێ نەکراوە. کەسیش بە قەدەر ئەو ـ رەحمەتی خوای لێ بێت ـ لەم سەردەمەدا خزمەتی حەدیسی نەکردووە، والله اعلم.

ـ ئیعتیمادم نەکردۆتە سەر مەزهەبێکی فیقهی دیاری کراو بەلّکو ئیعتیمادم بۆ رای فقهی کردۆتە سەر چەندین سەرچاوەی شەرع وەکو **فقه السنة ی سید سابق، نیل الاوطاری الشوكاني، توضيح الاحكامي ئال بسسام، ارواء الغليل ی ئەلبانی** کە توێژینەوەی زیاتر لە سێ هەزارحەدیسی منار السبيلی **ابن ضويانە** هەروەها فەتواکانی (**اللجنة الدائمة للبحوث والافتاء والارشاد**)ی وولاّتی حەرەمین، کە جێی متمانەن والحمد لله. ئەمانە جگە لە سەرچاوەکانی حەدیسی وەکو بوخاری و موسلیم هەروەها جگە لە کتێبی فیقهی مەزهەبەکان..

ـ هەولّیشم داوە کە مەسەلە تازەکانی رۆژووش باس کەم وەك بەکارهێنانی شرینقەو سپرای تەنگەنەفەسی و خوێن وەرگرتن و خوێندان و ئەوانە..

هیوادارم خوای پەروەردگار لێمان وەرگرێت و بە رەنجێکی دانێت کە بۆ روون کردنەوەی دینەکەی ئەو دراوە، ئومێدەواریشم موسولّمانان سوودی لێ وەرگرن و دوعایەکیش بۆ من بکەن، بە تایبەتی لە کاتی بەربانگ کردنەوەکانیاندا..

**وصلى الله على سيدنا وحبيبنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين**

١٢٤٦ك ـ ٢٠٠٥ز

# رۆژوو

رۆژوو لە رووی زمانەوانییەوە یەعنی خۆ گرتنەوە، ئەوی خۆی لە قسەکردنیش دەگرێتەوە پێی دەڵێن صائم، وەکو خوای گەورە دەفەرموێ: (إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْمًا) ١٩ مريم/ ٢٦ ئەو ئێستردی ئالیکیش ناخوات پێی دەڵێن فرس صائم.

لە رووی زاراوەییشەوە یەعنی: خۆگرتنەوە لەوانەی رۆژوو دەشکێنن، هەر لە سپێدەی بەیانییەوە تا خۆرئاوا بوون. لەگەڵ هەبوونی نییەتدا. واتە مەبەستی بوو بێت کە بە رۆژوو بێت نەك هەر خۆ لەو شتانە لەو ماوەیەدا بگرێتەوەو بەس.. ئیبنو حەجەر لە (فتح الباری) ی راڤەی بوخاریدا و ئیمامی نەوەوی لە راڤەی سەحیحی موسلیمەکەیدا دەفەرموون: رۆژوو: خۆ گرتنەوەیەکی تایبەتە، لە کاتێکی تایبەت و بە چەند مەرجێکی تایبەت..

رۆژووی رەمەزان کە لەسەر موسوڵمانان فەرز کرا، رۆژی دوو شەممە بوو، دوو رۆژ لە مانگی شەعبانیساڵی دووەمی کۆچی رۆیشتبوو.. پێغەمبەریش ﷺ نۆ رەمەزان بەرۆژوو بوو.

رۆژوو روکنێکی ئیسلامە، هەر کەس ئینکاری فەرزێتیەکەی بکات کافر دەبێت.

## حیکمەتی رۆژوو:

حیکمەتەکانی رۆژوو زۆرە، لەوانە:

- یەکێکە لە گەورەترین خواپەرستی نێوان بەندەو خوای خۆی، تەنها رۆژووەوان و خوای گەورە دەزانن کە رۆژووەکەی گرتووە یان نا، وە بە چ مەبەستێك گرتوویەتی.
- خۆ کۆنترۆڵ کردن و مەشق کردنی دەروونە لەسەر ئارامگری، هەر سێ جۆرە خۆگریەکەی تێدایە: رۆژوو خۆگرتنە لەبەر گوێڕایەڵی فەرمانی خوا، خۆگرتنەوەیە لە گوناح و تاوان، خۆگرتنە لەسەر ئازار لەبەر خاتری خوا..

ـ تاقیکردنەوەیەکە لەسەر نارەحەتی و برسێتی بوون و بێ بەش بوون! دوایش یاد خستنەوەی موسوڵمانە بەو نیعمەتانەی هەیبوونو لێی یاساغ بوونو بۆی گەرانەوە.. ئەمەش بۆ ئەوەیە، کە موسوڵمان هەست پێبکات، کە بە ملیۆنەها خەڵك هەن ساڵ دوازدە مانگە ئاوا برسین. (لە ژێر سایەی دادو بێدادی شارستانێتی رۆژئاوادا سازمانی نەتەوە یەکگرتووەکان دەڵێت: سێ ملیار برسی لە جیهاندا هەیە! ئەوانەی، کە رۆژانە کەمتر لە دوو دۆلاریان دەست دەکەوێت!!)

ـ رۆژوو پڕە لە سوودی تەندروستی، جۆرێکە لە چارەسەر، حەوانەوەی گەدەو دەزگاکانی هەرسە، پارسەنگ کردنەوەی هۆرمۆنەکانی لەشە..

## گەورەیی رۆژوو:

١ـ ئەبو هورەیرە ـ خوا لێی رازی بێت ـ لە پێغەمبەری نازدارەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە: (قالَ اللهُ عزَّ وَجَلَّ: كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ إلا الصيام، فَإنهُ لي وأنا أُجْزِئُ بِهِ. والصيامُ جُنَّةٌ. فَإذا كانَ يَومِ أحَدِكُمْ فَلا يَرْفَثْ ولا يَصخَبْ ولا يَجْهَلْ. فَإنْ شَاتَمَهُ أحَدٌ أو قَاتَلَهُ، فَلْيَقُلْ: إنِّـي صائم. مَرَّتَينِ. والّذي نَفْسُ محمدٍ بِيَدِهِ لَخُلوفُ فَمِ الصائمِ أطْيَبُ عِنْدَ اللهِ يَومَ القيامَةِ مِنْ رِيحِ المِسْكِ. والصائِمِ فَرْحَتَانِ يَفْرَحُهُمَا: إذا أفْطَرَ فَرِحَ بِفِطْرِهِ. وإذا لَقِيَ رَبَّهُ فَرِحَ بِصومِهِ) رواه احمد ومسلم والنسائي[1] واتە: خوای گەورە فەرموویەتی: هەموو کارەکانی مرۆڤ بۆ خۆیەتی، تەنها رۆژوو نەبێت. رۆژوو بۆ منەو منیش پاداشتی دەدەمەوە. رۆژوو قەڵغانە. هەر کەسێکتان بە رۆژوو بوو با شەڕە جنێو نەکات و نەکەوێتە هات و هاوارو گاڵتەو فشقیات. ئەگەر یەکێکیش

---

[1] مسلم: كتاب الصيام – باب فضل الصيام، برقم (١٦٣) (٢ / ٨٠٧)، والنسائي: كتاب الصيام – باب ذكر الاختلاف على أبي صالح في هذا الحديث، برقم (٢٢١٦) ٤/١٦٣و١٦٤) وأحمد في "المسند" (٢ / ٢٧٣).

شەڕی پێ فرۆشت با دوو جار بڵێ: من بەرۆژووم. بەو کەسەی گیانی محمدی بەدەستە بۆنی دەمی رۆژوودوان لای خوای گەورە، لە رۆژی دواییدا لە بۆنی میسك خۆشتر دەبێت. رۆژوودوان دوو خۆشحاڵی لە رێیە: کە بەربانگ دەکاتەوە بە رۆژوو شکاندنەکەی خۆشحاڵ دەبێت. کە بە خوای خۆشی دەگات بە پاداشتی رۆژووەکەی خۆشحاڵ دەبێت..

٢- ریوایەتی بوخاری و ئەبو داوود: (**الصيامُ جُنَّةٌ. فإذا كانَ أحَدُكُمْ صائماً فَلا يَرْفَثْ ولا يَجْهَلْ. فَإنْ امْرُؤٌ قَاتَلَهُ أو شاتَمَهُ، فَلْيَقُلْ: إنِّي صائم. مَرَّتَينِ. والّذي نَفْسُ محمدٍ بيَدِهِ لَخَلُوفُ فَمِ الصائمِ أطْيَبُ عِنْدَ اللهِ مِنْ رِيحِ المِسْكِ. يترك طعامَهُ وشَرابَهُ وشَهْوَتَهُ مِنْ أجْلِي. الصيامُ لِي وأنا أجزي بهِ. والحَسَنَةَ بِعَشْرَةِ أمْثالها**)[١] واتە: رۆژوو قەڵغانە. هەر کەسێکتان بە رۆژوو بوو با شەڕە جنێو نەکات و نەکەوێتە سوعبەت و گاڵتەو گەپ. ئەگەر یەکێکیش شەڕی پێ فرۆشت با دوو جار بڵێ: من بەرۆژووم. بەو کەسەی گیانی محمدی بەدەستە بۆنی دەمی رۆژوودوان لای خوای گەورە، لە رۆژی دواییدا لە بۆنی میسك خۆشتر دەبێت. ئەو لەبەر خاتری من وازی لە خواردن و خواردنەوەو حەزەکانی خۆی هێناوە. رۆژوو بۆ منەو خۆشم پاداشتەکەی دەدەمەوە، چاکەش دە قاتە.

٣- عبد اللهی کوڕی عەمر دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (**الصيامُ والقرآنُ يَشْفَعانِ لِلْعَبْدِ يومَ القيامَةِ. يقولُ الصيامُ أيُّ رَبِّ مَنَعْتُهُ الطعامَ**

---

[١] بخاري: كتاب الصوم – باب فضل الصوم (٣ / ٣١)، ومسلم، مختصراً: كتاب الصيام – باب فضل الصيام، برقم (١٦٣) (٢/ ٨٠٧)، وأبو داود مختصراً: كتاب الصوم – باب الغيبة للصائم، برقم (٢٣٦٣) (٢ / ٧٦٨) وابن ماجه: كتاب الصيام _ باب ما جاء في الغيبة والرفث للصائم، برقم (١٦٩١) (١/٥٣٩) والنسائي: كتاب الصيام – باب فضل الصيام، برقم (٢٢١٧) (٤ / ١٦٤)، والموطأ: كتاب الصيام – باب جامع الصيام، برقم (٥٧، ٥٨) (١ / ٣١٠)، وأحمد في "المسند" (٢/٢٤٥و٢٥٧و٢٧٣و٢٢٤) والبيهقي: كتاب الصيام – باب فضل شهر رمضان وفضل الصيام على سبيل الاختصار (٤ / ٣٠٤)

والـشَّهَوات بالنَّهـار فَـشَفِّعْني فيـه. ويقـولُ القُـرآن: مَنَعْتُـهُ النـومَ بالليـلِ فَشَفِّعْني فيه. فَيَشْفَعَانِ) رواه احمد بسند صَحيح[1] واتـه: رۆژوو قورئـان لـه رۆژی دواییدا تکا دەکەن بۆ خاوەنەکانیان رۆژوو دەفەرموێ: ئەی خوای گەورە من بە رۆژ خۆراك و حەزەکانم لێ گرتبۆوە، دە تـۆش لوتـف کـەو بمکـە تکـا کـاری. قورئانیش دەفەرموێ: نەمدەهێشت شەوانە بخەوێت، دە خوایە لوتف کەو بمکـە تکا کاری. ئینجا هەردووکیان تکای بۆ دەکەن.

٤ـ ئـەبو ئومامـه دەفـەرموێ: هاتمـه خزمـەت پێغەمبـەر ﷺ و عـەرزم کـرد: فەرمانێکم پێ بفەرموو تا بیکەم و پێی بچمه بەهەشتەوە. فـەرمووی: (عَلَيـكَ بالصوم فإنَّهُ لا عِدْلَ لَهُ)واته: رۆژوو بگرە، چونکە هیچ شتێك هاوتـای رۆژوو نییە. پاشان هاتمەوە خزمەتی هەر فەرمووی: (عَلَيكَ بالصيامِ) رواه احمد والنسائي والحاكم وصححه[2]

٥ـ ئەبو سەعیدی خودریش ـ خوا لێی رازی بێت ـ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبـەر ﷺ فەرمووی: (لا يَصومُ العَبدُ يوماً في سَبيلِ الله إلا باعَدَ اللهُ بِذلكَ اليـومِ النَّـارَ عنْ وَجْهِهِ سَبْعِينَ خَرِيفَـاً) رواه الجماعة إلا أبا داود[3] واتـه: هـەر بەندەیـەکی خـوا

---

[1] أحمد في "المسند" (٢ / ١٧٤)

[2] النسائي: كتاب الصيـام – باب ذكر الاختـلاف على محمد بن أبي يعقوب، في حديث أبي أمامة، في فضل الصائم، برقم (٢٢٢٣) (٤ / ١٦٦)، وأحمد في "المسند" (٥/٢٤٩و٢٦٤)، والحاكم: كتاب الصوم (١ / ٤٢١) وقال: هذا حديث صحيح الإسناد، ولم يخرجاه. ووافقه الذهبي.

[3] البخاري: كتاب الجهاد والسير – باب فضل الصوم في سبيل الله (٤ / ٣١، ٣٢)، ومسلم: كتاب الصيام – باب فضل الصيام في سبيل الله، لمن يطيقه بلا ضرر، ولا تفويت حق، برقم (١٦٧) (٢ / ٨٠٨)، والترمذي: كتاب فضائل الجهاد - باب ما جاء في فضل الصوم في سبيل الله، برقم (١٦٢٣) (٤ / ١٦٦)، وابن ماجه: كتاب الصيام – باب في صيام يوم في سبيل الله، برقم (١٧١٧) (١ / ٥٤٧، ٥٤٨)، والنسائي: كتاب الصيام – باب ثواب من صام يوماً في سبيل الله، وذكر الاختلاف على سهيل بن أبي صالح، برقم (٢٢٥٠،٢٢٤٦) (٤ / ١٧٣)، والدارمي: كتاب الجهاد – باب من صام يوماً في سبيل الله، عز وجل (٢/ ٢٠٣)، وأحمد في "المسند" (٣ / ٢٦، ٥٩، ٨٣).

رۆژێك لەبەر خاتری خوا بەرۆژوو بێت؛ خوای گەورە بەو رۆژە ماوەی حەفتا پایزەرێ ئاگری دۆزەخی لێ دوور دەخاتەوە.

٦ـ سەهلی کوڕی سەعدیش گێڕاوێتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (إنَّ للْجَنَّة باباً يُقَالُ لَهُ الرَّيَّانُي قَالُ يومَ القيامَة: أينَ الصائمونَ؟ فإذا دَخَلَ آخرُهُمْ أُغْلِقَ البابُ) رواه البخاري ومسلم[١] واتە: بەهەشت دەرگایەکی هەیە پێی دەڵێن رەییان. لە رۆژی دواییدا بانگ دەکرێت: کوا رۆژووەوانان؟ (واتە با بێن و لەم دەرگایەوە بچنە بەهەشتەوە) جا کە کۆتا رۆژووەوان چووە ژورێ ئیتر دادەخرێت..

# بەشەکانی رۆژوو

رۆژوو دوو بەشە:

رۆژووی فەرز و رۆژووی سوننەت.

رۆژووی فەرزیش سێ جۆرە:

رۆژووی رەمەزان. رۆژووی کەفارەت. رۆژووی نەزر..

ئێمە لێرەدا تەنها باسی رۆژووی رەمەزان و رۆژووی سوننەت دەکەین، جۆرەکانی تر هەر یەکەیان لە شوێنی خۆیاندا باس دەکرێن ان شاء الله.

---

[١] البخاري: كتاب الصوم – باب الريّان للصائمين (٣ / ٣٢)، ومسلم: كتاب الصيام – باب فضل الصيام، برقم (١٦٦) (٢ / ٨٠٨)، والنسائي، بلفظ متقارب: كتاب الصيام – باب فضل الصيام، برقم (٢٢٣٦، ٢٢٣٧) (٤ / ١٦٨)، وأحمد في "المسند" (٥ / ٣٣٣)، وابن ماجه: كتاب الصيام – باب ما جاء في فضل الصيام، برقم (١٦٤٠) (١ / ٥٢٥)، والبيهقي: كتاب الصيام – باب في فضل شهر رمضان، وفضل الصيام على سبيل الاختصار (٤ / ٣٠٥) .

# رۆژووی رەمەزان

## حوكمەكەی:

رەمەزان ناوی نۆیەم مانگی عەرەبییە، بۆیە پێی ووتراوە رمضان چونكە لەو مانگەدا بەردی بیابانی نیوە دورگەی عەرەبی لە گەرماندا سوور دەبۆوە، لە كرداری رابوردووی (رَمَضَ الحَرُّ) ەوە هاتووە.

رۆژووی رەمەزان بە پێی بەڵگەی قورئان و حەدیس و كۆڕا (ئیجماع) فەرزە

- خوای گەورە دەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِيامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ) ٢ البقرة/١٨٣ واتە: ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە رۆژووتان لەسەر فەرزە، هەر وەكو كە لەسەر ئەوانەی پێش ئێوە فەرز بوو، تا پارێزكاری بكەن. هەروەها: (شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ) ٢ البقرة/١٨٥ واتە: مانگی رەمەزان، ئەو مانگەیە كە قورئانی تێدا هاتۆتە خوارەوە، تا ببێتە مایەی رێنمایی خەڵكی و بەڵگەو نیشانەی رۆشنی هیدایەتو ناسینەوەو هەڵاوێردنی حەق و باتڵ. جا هەر كەستان ئامادەی مانگەكە بوو (واتە گەیشتەوە رەمەزان) با بەرۆژوو بێت..
- لە زۆر حەدیس دا فەرز بوونی رۆژووی رەمەزان باس كراوە. وەكو ئەوەی كە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (بُنِيَ الاسلامُ علَى خَمْسٍ: شَهَادة أنْ لا الهَ الا اللهُ وأنَّ محمداً رسُولُ الله، وإقامِ الصلاةِ وإيتاءِ الزَّكاةِ، وصيامِ رمضانَ وحَجِّ البيتِ)[1] واتە: ئیسلام لەسەر پێنج پایە بنیات نراوە: شایەتمان لااله الا الله محمد رسول الله و نوێژ كردن و زەكات دان ورۆژوو گرتن و حەج (زیارەت)ی ماڵی خوا.

---

[1] البخاري بمعناه: كتاب المغازي – باب وفد عبد القيس (٥ / ٢١٣) وكتاب الإيمان - باب أداء الخمس من الإيمان (١ / ٢٠، ٢١) وكتاب العلم – باب تحريض النبي صلى الله عليه وسلم وفد عبد القيس أن يحفظوا الإيمان... (١ / ٣٢)، ومسلم: كتاب الإيمان - باب بيان أركان الإسلام ودعائمه العظام، برقم (٢١، ٢٢) (١ / ٤٥) والترمذي: كتاب الإيمان – باب إضافة الفرائض إلى الإيمان برقم (٢٦١٤) والنسائي: كتاب الإيمان - باب أداء الخمس برقم (٥٠٣٤)

تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵە خوا لێی ڕازی بێت کە لە عەشەرەی موبەششەرەیە دەفەرموێ: کابرایەك لە پێغەمبەری ﷺ پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو ڕۆژوودم پێ بڵێ کە خوای گەورە لەسەرمانی فەرز کردووە فەرمووی: (شهرُ رمضان) ووتی: ئایا هیچی تر لەسەر فەرزە؟ فەرمووی: (لا. إلاّ أنْ تَطَوَّعَ)[1] واتە: نا مەگەر خۆت لە زیادە هی تر بگریت.

ئوممەتی ئیسلام لەسەر ئەوە کۆکن کە گرتنی ڕۆژووی ڕەمەزان فەرزە و یەکێکیشە لە پێنج پایەکانی ئیسلام کە لە بەڵگەنەویستەکانی دینی ئیسلامەو هەر کەس نکوڵی لێ بکات کافر دەبێت و حوکمی لە دین هەڵگەڕاوەی بەسەردا دەچەسپێت.

## گەورەیی ڕۆژووی ڕەمەزان:

١ـ ئەبو هورەیرە ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ دەگێڕێتەوە کە ساڵێك کە ڕەمەزان نزیك بۆوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (قدْ جاءكُمْ شهرٌ مبارَكٌ، افْتَرَضَ اللّهُ عليكُمْ صيامَهُ، تَفْتَحُ فيه أبْوابُ الجنّة، وتغلقُ فيه أبوابُ الجَحيمِ، تُغلُّ فيه الشياطينُ، فيه ليلةٌ خيرٌ منْ ألفِ شهْرٍ، مَنْ حُرِم خيرَهَا، فَقَدْ حُرِمَ)[2]. رواه أحمد

---

[1] البخاري: كتاب الإيمان – باب الزكاة من الإسلام (١ / ١٨) وكتاب الصوم – باب وجوب صوم رمضان (٣ / ٣٠، ٣١)، ومسلم: كتاب الإيمان – باب بيان الصلوات التي هي أحد أركان الإسلام، برقم (٨) (١ / ٤٠) وأبو داود: كتاب الصلاة – باب فرض الصلاة، برقم (٣٩١) (١ / ٢٧٢) والنسائي: كتاب الصيام - باب وجوب الصيام، برقم (٢٠٩٠) (٤ / ١٢٠) والموطأ: كتاب قصر الصلاة في السفر - باب جامع الترغيب في الصلاة برقم (٩٤) (١ / ١٧٥) ورواه الشافعي في "الرسالة"، فقرة (٣٤٤) بتحقيق أحمد محمد شاكر.

[2] النسائي: كتاب الصيام – باب فضل شهر رمضان، وذكر الاختلاف على معمر فيه، برقم (٢١٠٦) (٤ / ١٢٩)، وأحمد في "المسند" (٢ / ٢٣٠، ٣٨٥، ٤٢٥)، والبيهقي بمعناه: كتاب الصيام – باب في فضل شهر رمضان، وفضل الصيام على سبيل الاختصار (٤ / ٣٠٣).

٢ـ عەرفەجە ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: لە لای عوتبەی کوڕی فەرقەد بووم، باسی ڕەمەزانی بۆ دەکردین. لەو کاتەدا یاوەرێکی پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەوە. کە عوتبە دیتی، بێ دەنگ بوو، قەدرو ڕێزێکی زۆریشی لەونا. دوایی یاوەرەکە فەرمووی: گوێم لێ بوو، کە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ڕەمەزان دەیفەرموو: (تُغْلَقُ أبوابُ النارِ وتُفْتَحُ أبوابُ الجنَّةِ، وتُصفدُ فيهِ الشياطينُ) واتە: دەرگاکانی دۆزەخی تێدا دادەخرێت و دەرگاکانی بەهەشتی تێدا دەکرێتەوەو شەیتانەکانی تێدا زنجیرەبەند دەکرێت. پاشان فەرمووی: (ويُنادِي فيهِ ملَكٌ: يا باغِيَ الخَيرِ، أبْشِرْ، ويا باغِيَ الشَّرِّ، أقْصر. حتى يَنْقَضِي رمضانُ)[1]. رواه أحمد، والنسائي، وسنده جيد واتە: فریشتەیەکیش بانگ دەکات: هۆ خێرخواز مژدەت لێ بێت و هۆ شەڕخواز دەست کورت بیت.. تا ڕەمەزان تەواو دەبێت .

٣ـ ابو هورەیرەش دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (الصلوَاتُ الخَمْس، الجُمُعَةُ إلى الجمُعَةِ، ورَمضانُ إلى رمضانَ، مُكفِّرَاتٌ لِمَا بَيْنَهُنَّ، إذا اجْتُنِبَتِ الكبَائِرُ)[2] رواه مسلم. واتە: پێنج فەرزی نوێژەکان، هەینی بۆ هەینی و ڕەمەزان بۆ ڕەمەزان پاك کەرەوەی گوناحن، بۆ کەسێك کەبائیر (گوناحە گەورەکان)ی تێدا نەکردبێت.

---

[1] النسائي، بلفظ متقارب: كتاب الصيام – باب فضل شهر رمضان، وذكر الاختلاف على معمر فيه، برقم (٢١٠٧) (٤ / ١٢٩، ١٣٠) والبيهقي: كتاب الصيام / باب في فضل شهررمضان، وفضل الصيام على سبيل الاختصار، (٤ / ٣٠٣) وأحمد في "المسند" (٤ / ٣١١،٣١٢) (٥/٤١١).

[2] مسلم: كتاب الطهارة – باب الصلوات الخمس، والجمعة إلى الجمعة، ورمضان إلى رمضان، مكفرات لما بينهن، ما اجتنبت الكبائر، برقم (١٦)

٤ـ ئەبو هورەیرە دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مَنْ صامَ رمضانَ إيماناً واحْتساباً، غُفرَ لَهُ ما تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ )[١] رواه البخاري، ومسلم. واته: هەر كەس رۆژووی ڕەمەزان بە باوەڕەوەو بۆ خوا بگرێت، لە گوناحەكانی پێشووی دەبوورێت.

## گوناحی نەگرتنی ڕەمەزان:

١ـ ئیبن عەبباس ـ خوا لێیان ڕازی بێت ـ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (عُرَى الإسلامِ وقواعدُ الدينِ ثلاثةٌ عليهنَّ أُسِّسُ الإسلامِ، مَنْ تَرَكَ واحدَةٍ منْهُنَّ فهو بها كافرٌ حَلالُ الدَّمِ؛ شهادةُ أنْ لا إلهَ إلا اللّهُ، والصلاةُ المَكْتُوبَةُ، ويَومُ رمضانَ )[٢] رواه ابو يعلى والديلمي وصححه الذهبيواته: پەیكەر و

---

[١] البخاري: كتاب الصوم _ باب من صام رمضان إيماناً واحتساباً ونية... (٣ / ٣٣)، وباب فضل ليلة القدر (٣ / ٥٩)، ومسلم: كتاب صلاة المسافرين وقصرها – باب الترغيب في قيام رمضان، وهو التراويح، برقم (١٧٥) (١ / ٥٢٣، ٥٢٤)، وأبو داود: كتا ب الصلاة (تفريع أبواب شهر رمضان) – باب في قيام شهر رمضان، برقم (٢/١٠٣) (١٣٧٢)، والنسائي: كتاب الصوم – باب ما جاء في قيام شهر رمضان، برقم(٤/١٥٧) (٢٢٠٣ و ٢٢٠٥)، والترمذي: كتاب الصوم – باب ما جاء في فضل شهر رمضان، برقم (٦٨٣) (٣ / ٥٨)، وابن ماجه: كتاب إقامة الصلاة والسنة فيها – باب ما جاء في قيام شهر رمضان برقم (١٣٢٦) (١/٤٢٠) (١/٢٠٩) وأحمد في "المسند" (٢ / ٤٠)

[٢] مجمع الزوائد للهيثمي (١ / ٤٧، ٤٨) وقال: رواه أبو يعلى بتمامه، ورواه الطبراني في "الكبير" بلفظ: "بني الإسلام على خمس". فاقتصر على ثلاثة منها، ولم يذكر قول ابن عباس الموقوف، وإسناده حسن. وفي "الترغيب والترهيب" للمنذري (١/٣٨٢) : رواه أبو يعلى، وإسناده حسن، ورواه سعيد بن زيد أخو حماد بن زيد، عن عمرو بن مالك النكري، عن أبي الجوزاء، عن ابن عباس مرفوعاً، وقال فيه: "من ترك منهن واحدة، فهو باللّه كافر، ولا يقبل منه صرف ولا عدل، وقد حل دمه". وعزاه ابن حجر في" المطالب العالية"، برقم (٢٨٦٣) (٣ / ٥٥) لأبي يعلى، وقال: قال حماد: ولا أعلمه إلا قد رفعه إلى النبي صلى الله عليه وسلم. وفي "الدر المنثور" للسيوطي (١/٢٩٨) : أخرجه أبو يعلى، عن ابن عباس مرفوعاً، والحديث ضعيف، تمام المنة

ڕێسای دینەکە سێ بونیادی ئیسلامیان لەسەر وەستاوە. هەر کەس هەر یەکیان واز لێ بێنێت پێی کافرو خوێنی حەڵاڵ دەبێت: شایەتمان هێنان، نوێژە فەرزەکان، ڕۆژووی ڕەمەزان.

٢ـ ئەبو هورەیرەش دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مَنْ أفْطَرَ يَوماً مِنْ رمضانَ، في غيرِ رُخصةٍ رَخّصها اللّهُ لَهُ، لَمْ يَقضِ عَنْهُ صِيامُ الدَّهْرِ كُلِّه، وإنْ صامَهُ[١] رواه أبو داود، وابن ماجه، والترمذي، وقال البخاري: ويذكر عن أبي هريرة رَفَعَه: (مَنْ أفطَرَ يوماً مِنْ رمضانَ مِنْ غَيرِ عُذْرٍ، ولا مَرَضٍ، لمْ يَقْضِه يَومُ الدَّهْرِ، وإنْ صامَهُ). واتە: هەر کەس ڕۆژێك بخوات لە ڕەمەزانەکە بێ مۆڵەتێك، کە خوای گەورە داویەتیە (واتە بێ عوزرێکی شەرعی) ئەگەر ساڵەکە هەمووی بەڕۆژوو بێتەوە ناکەوێتە بری ئەو ڕۆژەی خواردویەتی. ڕیوایەتەکەی تریش دەفەرموێ: هەر کەس ڕۆژێك لە ڕەمەزان بی عوزرو بێ نەخۆشی بخوات، ئەگەر هەموو ساڵەکە بەڕۆژوو بێتەوە ناکەوێتەوە بری ئیبن مەسعودیش وای فەرمووە[٢].

ئیمامی زەهەبی ـ رحمه الله ـ دەفەرموێ: ئەوە لای موسوڵمانان بەڵگە نەویستێکی بڕیار دراوە. چونکە هەر کەس ڕۆژووی ڕەمەزان بێ عوزری نەخۆشی (بێ گومان سەفەرو ئەوانی تریش)بشکێنێت، ئەو کەسە لە زیناکارو شەراب خۆر خراپترە.. بگرە هەندێك زانا گومانیان لە ئیسلامەتیەکەی هەیە. هەن لە ڕیزی زەندیق و خراپەکارانی تردا حسێبیان کردوون..

---

[١] الترمذي: كتاب الصوم – باب الإفطار متعمداً، برقم (٧٢٣) (٣ / ٩٢)، وأبو داود: كتاب الصوم – باب التغليظ في مَنْ أفطر عمداً، برقم (٢٣٩٦، ٢٣٩٧) (٢ / ٧٨٨، ٧٨٩) وابن ماجه: كتاب الصوم – باب كفارة من أفطر يوماً من رمضان، برقم (١٦٧٢) (١/٥٣٥)، والدارمي: كتاب الصوم – باب من أفطر يوماً من رمضان متعمداً (٢ / ١٠)، وأحمد في "المسند" (٢ / ٤٥٨، ٤٧٠)، وهو ضعيف، انظر: تمام المنة (٣٩٦).

# دیاریکردنی مانگی ڕەمەزان

## ( شایەتی یەك كەس بەسە بۆ گرتن و شكاندن و كۆتایی پێ هێنانی )

مانگی ڕەمەزان بە بینینی هەیڤ ( مانگ: هلال ) دیاری دەکرێت[١].

ئەگەر یەك موسوڵمانی سەر ڕاست و ڕاستگۆ(ژن بێت یان پیاو ) شایەتی بدات کە بینیوێتی، دەبێت موسوڵمانان بەرۆژوو بن یان بیکەن بە جەژن. حوکمی هەیڤ بینینێتی نەك حساباتی گەردوونی.. بەم شێوەیە سەرەتای ڕەمەزان دیاری دەکرێت، یان دەبێت ٣٠ سی ڕۆژەی مانگی پێش ڕەمەزان ـ کە شەعبانە ـ تەواو کەن، ئینجا بیکەنیْ:

١ـ ئیبنو عومەر ـ خوا لێیان ڕازی بێت ـ فەرمووی: ( قالَ: تَراءى النَّاسُ الهلالَ، فأخبرتُ رسولَ اللّه ﷺ، أنِّي رأيتُه، فَصامَ وأمَرَ الناسَ بصيامه )[٢]. رواه أبو داود. والحاكم. وابن حِبّان، وصححاه. واتە: جارێك لەگەڵ خەڵكیدا بۆ هەیڤ دەگەڕاین کە دیتم، هەواڵم دایە پێغەمبەر ﷺ کە من بینیم. ئیتر هەم خۆی بەرۆژوو بوو هەم فەرمانیدا بە خەڵکەکەش، کە بەرۆژوو بن. کەوا بوو بڵاو کردنەوەی هەواڵی ڕۆژووەکەش لەسەر بەرپرسان و کاربەدەستان فەرزە..

---

[١] ( لە عەرەبیدا مانگی یەك شەوە تا سێشەوە پێی دەوترێت: هلال، لەوە بە دوا پێی دەوترێت: قەمەر، ئینجا مەحاق، ئینجا بەدر، کە مانگی چواردەیە ).

[٢] أبو داود: كتاب الصوم – باب في شهادة الواحد على رؤية هلال رمضان، برقم (٢٣٤٢) (٢ / ٧٥٦)، والحاكم: كتاب الصوم – باب قبول شهادة الواحد على رؤية هلال رمضان (١ / ٤٢٣) وقال: صحيح على شرط مسلم، ولم يخرجاه. وسكت عليه الذهبي، والإحسان بترتيب صحيح ابن حبان: كتاب الصوم – باب رؤية الهلال، برقم (٣٤٣٨)(٥/١٨٧ و ١٨٨) وقال الدارقطني: تفرد به مروان بن محمد، عن ابن وهب، وهو ثقة/ المنذري).

٢ـ ئەبو هورەیرە -خوا لێی ڕازی بێت- دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (صومُوا لِرؤيَتَهَ وأفْطِرُوا لِرؤيتِهِ، فَإنْ غُمَّ عليكم، فأكمِلُوا عِدَةَ شَعبانَ ثلاثِينَ يوماً )[1] رواه البخاري ومسلم واتە: کە هەیڤتان بینی بەڕۆژوو بن، کە بینیشتان (ئێوارەی جەژن) بیشکێنن. ئەگەر هەور ڕێی بینینی گرتبوون ٣٠ سی ڕۆژەی شەعبان تەواو کەن..

## لێرەدا ڕاجوێییەك لە نێوان زانایاندا هەیە:

ئیمامی ترمذی دەفەرموێ: زۆر لەزانایان. لەوانە عبداللە ی کوڕی موبارەك و ئیمامی شافیعی (لە یەکێك لە فەتواکانیدا) و ئیمامی ئەحمەد فەرموویانە: بۆ بەڕۆژوو بوون، شایەتی یەك شاهێد بەسە. ئیمامی نەوەویش (لە ڕاڤەی سەحیحی موسلیمدا) فەرموویەتی: ئەمە بۆ دیاری کردنی ڕەمەزانەکە، وایەو ڕاستە ، بەڵام بۆ هەیڤی شەووال (واتە بۆ ئەوەی کە بکرێت بە جەژن) هەر دەبێت لانی کەم دوو کەسی ڕاستگۆ شاهێدی بدەنیان دەبێت (٣٠) سی ڕۆژەی ڕەمەزانەکە تەواو بکرێت. چونکە بە ڕای زۆرینەی زانایان شاهێدی یەك شایەتی ڕاستگۆ بەس نییە بۆ ئەوەی بکرێت بە جەژن. بە لای ئەبو ثورەوە جیاوازی نییە لە نێوان بینینی هەیڤی ڕەمەزان و هەیڤی شەووال. چونکە ئەو دەفەرموێ: شایەتی یەك شاهێدی ڕاستگۆ بۆ دیاری کردنی هەردووکیان بەسە.

---

[1] البخاري: كتاب الصوم - باب قول النبي صلى الله عليه وسلم: "إذا رأيتم الهلال فصوموا... " (٣ / ٢٤، ٣٥) ومسلم: كتاب الصيام – باب وجوب صوم رمضان لرؤية الهلال، برقم (٤، ١٨، ١٩، ٢٠) (٢/ ٧٥٩-٧٦٢) والترمذي: كتاب الصوم – باب ما جاء لا تَقَدَّمُوا الشهر بصوم، برقم ٣/ ٥٩ - ٦٠ (٦٨٤) ومن طريق ابن عباس: باب ما جاء أن الصوم لرؤية الهلال، والإفطار له، برقم (٦٨٨) (٣ / ٦٣)، والنسائي: كتاب الصيام – باب إكمال شعبان ثلاثين إذا كان غيم، وذكر اختلاف الناقلين عن أبي هريرة، برقم (٢١١٧، ٢١١٨) (٤ / ١٣٣) وترجم له ابن ماجه: كتاب الصوم – باب ما جاء في: "صوموا لرؤيته، وأفطروا لرؤيته"، برقم ٥٣٠/١ (١٦٥٥) والدارمي: كتاب الصوم – باب الصوم لرؤية الهلال (٢ / ٣) وأحمد في" المسند" (٤ / ٢٣، ٥ / ٤٢)

ئیمامی مالك والليث والاوزاعي والثوري و ئیمامی شافیعی (لە قەولێکی تریدا) دەفەرموون: شایەتی یەك کەس بەس نییە.. ئەمەشە رای (اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والافتاء / ی وولاتی حەرەمەینە ـ ژمارە ١٦١٥ لە ١١/ ٧/ ١٣٩٧)

ئیبنو روشد دەفەرموێ: بۆچوونی ئەبو بەکری کوڕی المنذر هەر وەکو بۆچوونی ئەبو ثورە، واش دەزانم ئەمە مەزهەبی زاهیریەکانیشە..

ابن المنذر دەفەرموێ: مادام زانایان کۆڕان (ئیجماعیان هەیە) کە بە پێی شاهێدی یەك کەس نوێمەتەکە بەرۆژوو دەبێت؛ کەوا بوو دەبێ شاهێدی یەك کەسیش بەس بێت بۆ دەست پێ کردن و کۆتایی هێنان بە رۆژوو. چونکە نیشانەی دیاری کردنی هەردووکیان هەر یەکە..

شەوکانی دەفەرموێ: مادام هیچ بەڵگەیەك نەبێت خەڵکی پابەند کات بە شاهێدی زیاتر لە یەك شاهێدەوە، کەوا بوو بە گوێرەی پێوان (قیاس) لەسەر رۆژوو گرتنەکە ـ کە بە شایەتی یەك شاهێدی راستگۆ لەسەر هەموان فەرز دەبێت ـ کۆتایی هێنانەکەش بە شایەتی یەك شاهێدی راستگۆ دەبێت.. هەروەها مادام خواپەرستی دەشێت بە شاهێدی یەك شاهێد فەرز بکرێت، کەوا بوو بۆ فەرز بوونی پەرستنەکانی تریش هەر وا دەبێت.. مەگەر بەڵگەیەك هەبێت ئەو حوکمە گشتییە تایبەت کات. وەکو شایەتی دان لەسەر پارەو سامان و مامەڵەو شتی وا.. بۆیە بۆچوونەکەی ئەبو ثور راستترە..

**تویژینەوەی شەوکانی هاورایانی بە بەهێز دەبینم، بەڵام رای ئیمامی نەوەوی و زانایانی حەرەمەینم لا پەسەندترە، کە دەفەرموون: شایەتی یەك کەس بەسە بۆ سەلماندنی هاتنی رەمەزان، بەڵام بۆ کۆتایی پێ هێنانی فەرزەکە دوو شاهیدی یان زیاتری پێویستە..**

ـ بۆ دیاری کردنی رەمەزان و جەژن دەبێت ئیعتیماد بکرێتە سەر بینینی هەیڤ، نەك رۆژژمێرو حساباتی فەلەکی (گەردوونناسی). ئیمامی ئیبنو تەیمییە دەفەرموێ: ئەوی ئیعتیماد بکاتە سەر حساباتی فەلەکی لە رووی شەرعیەوە گومڕایەو لە دینیشدا بیدعەچییە..

## جیاوازی ئەو شوێنانەی هەیڤیان لێوە هەڵدێت:

جمهوری زانایان و ئیمامان ئەبو حەنیفەو مالیك و هەندێك لـە شـافیعیەكان و ئەحمەد فەرموویانە: راجوێیی دەربارەی ئەو شوێنانەی كە هەیڤیان لێوە هەڵ دێـت، هیچ كارتێكردنێكی لەسەردیاری كردنی رەمەزان و تەواو بوونی نییە. هەر كاتێـك خەڵكی ناوچەیەك هەیڤی یەك شەوەی رەمەزانیان بینی، هەم فەرزە خۆیان بەرۆژوو بن هەم فەرزە لەسەر هەموو موسوڵمانان ـ لە هەر وولاتێـك بـن ـ بـەرۆژوو بـن. چونكە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (صوموا لرؤيَتـهَ وأفْطـرُوا لرؤيتـه) ئەمـەش فەرمانێكی گشتییەو هەموو ئوممەتەكە دەگرێتـەوە. كـەوا بـوو لـە هـەر جێیـەك هەیڤی مانگی رەمەزان بینرا، رۆژوو لەسەر هەر هەموو موسوڵمانان فەرز دەبێت.

بەڵام عیكرەمەو القاسمی كوڕی محمـد و سـالم و ئیـسحاق و رایـەكی دروسـتی حەنەفیەكان و رای پەسەندیش لای شافیعیەكان دەڵـێن: نـا هـەر وولاتـەو دەبێـت هەیڤی خۆیان ببیـنن ئـەوجا رۆژوویـان لەسـەر فـەرز دەبێـت.. چـونكە كورەیـب دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: قدمتُ الشام، واستهلَّ عليَّ هلالُ رمـضانَ وأنـا بالـشامِ، فرأيتُ الهلالَ ليلةَ الجمعةِ، ثمَّ قَدِمْتُ المدينةَ في آخر الشَّهرِ، فَسَأَلَني ابـنُ عبَّـاس – باسی هەیڤ دیتنی كـرد – فقـال: متـى رأيـتم الهـلالَ؟ فقلـتُ: رأينـاهُ ليلـةَ الجمعةِ. فقالَ: أنتَ رأيتَهُ؟ فقلتُ: نَعَمْ، ورآه النـاسُ وصـامُوا، وصـامَ معاويـةُ. فقالَ: لكنَّا رأينـاهُ ليلةَ السبتِ، فلا نزالُ نصومُ، حتى نُكمـلَ ثلاثـينَ، أو نَـراهُ. فقلتُ: ألا تكتفي برؤيةِ معاويةَ، وصيامِه؟ فقالَ: لا، هكَذا أمرنا رسول اللّه ﷺ [1]
رواه أحمد، وسلم، والترمذي. وقال الترمذي: حسن صحيح غريب لە شام بووم شەوی هەینی بوو كە هەیڤی رەمەزانمان بینی. لە كۆتایی مانگدا هاتمە مەدینە. ئیبنو عەبباس لێی

---

[1] مسلم: كتـاب الصيـام – بـاب بيان أن لكـل بلـد رؤيـتهم، وأنهـم إذا رأوا الهـلال ببلـد لا يثبـت حكمه لما بعد عنهم، برقم (٢٨)(٢ / ٧٦٥)، والترمذي: كتاب الصوم – باب ما جاء لكل أهل بلد رؤيتهم، برقم (٦٩٣)(٣ / ٦٨، ٦٩) وقال أبو عيـسى: هـذا حـديث حـسن صـحيح غريـب. وأبو داود: كتاب الصوم – باب إذا رئي الهلال في بلد قبل الآخـرين بليلـة، بـرقم (٢٣٣٢)(٢ / ٧٤٨)، والنسائي: كتاب الصيام – باب اختلاف أهل الآفاق في الرؤية، برقم (٢١١١)(٤ / ١٣).

پرسیم: کەی هەیڤتان دی؟ ووتم: شەوی هەینی. پرسی: تۆ خۆت بینیت؟ ووتم: بەلێ، منیش و خەلکیش دیمان و خەلکیش بەرۆژوو بوون، معاویەش بەرۆژوو بوو. ئەو فەرمووی: بەلام ئێمە شەوی شەممە بینیمان، بەرۆژووش دەبین تا هەیڤی مانگی شەووال دەبینین یان ٣٠ سی رۆژەکەی تەواو دەکەین. ووتم: چما بە حوکمی بینین و رۆژوو گرتنەکەی معاویە ناکەیت؟ فەرمووی: نا.. پێغەمبەر ﷺ ئاوا فەرمانی داوە بۆیە بە پێی ئەم حەدیسەیە کە هەندێك زانا رایان وایە کە هەر وولاتەو دەبێت هەیڤی خۆیان ببینن تا بەرۆژوو بن..

لە کتێبی فتح العلام شرح بلوغ المرام دا هاتووە: راستتر وایە کە ئەگەر ناوچەیەك هەیڤیان بینی بەرۆژوو دەبن، ئەو ناوچانەش هەر دەبێت بەرۆژوو بن کە لە دەورو بەری ئەوانەن کە هەیڤەکەیان دیووە..

هەندێك زانای سەردەمیش ئەمەیان پێ راست بوو، بەلام ئێستا کە هۆکارەکانی گەیاندن و راگەیاندن هەموو دنیایان کردووە بە گوندێکی جیهانی، بە چرکەو خولەك دەتوانرێت هەوالی دیتنی هەیڤ لە ناوچەیەك بگەیێنرێتە هەر هەموو موسولمانان لە هەر وولات و ناوچەیەکی سەر زەمین بن، ئیتر ئەم ئیختیلافە بۆچی هەر بەردەوام بێت..

**من رام وایە: مادام زانایانی حەرەمەین بە تەلسکۆب سەیری هەیڤ دەکەن، کە بینییان و شوێنەکەیان دیاری کرد، ئینجا بە چاو تەماشای دەکەن، ئەگەر ئەوان حوکمی رۆژووەکەیان راگەیاند ـ کە بە تەلەفزیۆن و ئینتەرنێتیش بلاو دەبێتەوە ـ ئیتر فەرزە لەسەر موسولمانان بە پێی فەتواکەی ئەوان بەرۆژوو بن.. موسولمانان عوزری ئەوەیان نامێنێت پێکەوە بەرۆژوو نەبن، من بۆ خۆشم ئەگەر زانایانی حەرەمەین ووتیان رەمەزانە یان جەژن منیش دەیکەمێ، چونکە نزیکەی ٣٠ سال زیاترە هەستم پێ نەکردووە زانایانی وولاتی حەرەمەین فەتوای خۆیان لەم مەسەلەدا ـ وەکو زانایانی زۆر وولاتی تر ـ پەیوەست کەن بە سیاسەتی دەرەوەی وولاتەکەیانەوە، بۆیە تا ئێستا لەم مەسەلەیاندا هێشتا جێ متمانەی من ماوون، جگە لەوەی دەشزانم کە الحمد لله شارەزاو پسپۆری گەردووناسیشیان لەگەلدایە.**

بە تايبەتی کە سايەسەتی حکومەتی وولاتان لەگەڵ رۆڵی سياسەتدا دەگەڕێت بۆيە دەبينی قازی و موفتی رەسمی جاری وا هەيە لەبەر خاتری سياسەتی وولات يان لە ترسی کاربەدەستانی ناهێڵێت موسوڵمانان لەگەڵ يەکتر بە رۆژوو بن! ئاسەواری ئەمەش خراپە. دەمانبينی تەوێلەيی يان قەلادزێيی بەرۆژوو دەبوو کەچی پاوەيی و سەردەشتی بەرامبەری دوای دوو رۆژی تر پێ دەبوو، يان هەر لە يەك شاری وەك پێشاوەری پاکستان سێ رۆژی جياواز بەرۆژوو دەبوون، يەك شار بەڵام سێ رۆژی جياواز!

ئەگەر کەسێك لە وولاتێك بەرۆژوو بوو، دواتر چووە وولاتێکی تر، بينی وولاتی دووەم رۆژێ يان دوو رۆژ لەدوا ترن، گەر هەر لەوێ مايەوە، دەبێت لەگەڵ ئەوان جەژن بکات با رۆژێك يان دوو رۆژيش زياتر بەرۆژوو بوو بێت

## ئەو کەسەی تەنها خۆی هەيڤ دەبينێت:

پێشەوايانی شەرع ـ جگە لە عطاء ـ لەسەر ئەوە رێکن کە هەر کەس بە تەنها خۆی هەيڤی بينی دەبێ بەرۆژوو بێت چونکە پێغەمبەر ﷺ رۆژووەکەی بە بينينی هەيڤ فەرز کردووە ، کابراش کە خۆی بە چاوی خۆی هەيڤی بينيووە، يەقينی بۆ پەيدا بوودو دڵنيا بووە لە فەرز بوونی رۆژووەکەی بۆيە حەتمەن دەبێ بە تەنهاش بێت هەر بەرۆژوو بێت.. ئەمەش پەيوەندی بە هەستەوەرەکانی خۆيەوە هەيە، با تەنها خۆشی بينيبێتی.. بەڵام زانايان لە بينينی هەيڤی شەووالدا راجۆرن. راو هەڵوێستی ئيمامی شافيعی و ئەبو ثور بەجێيە کە دەفەرموون هەيڤی رەمەزان ببينێت بە تەنهاش بێت دەبێ بەرۆژوو ببێت، بەڵام بۆ هەيڤی جەژن، بەرۆژوو نابێت، بەڵام نابێ پێوەی دەرکەوێت کە بەرۆژوو نيە..

# ڕوكنەكانی ڕۆژوو

ڕۆژوو دوو ڕوكنی هەیە، بە هەبوونی هەردووكیان ڕۆژوو دادەمەزرێت:

١ـ خۆ گرتنەوە لەوانەی ڕۆژوو دەشكێنن، هەر لە سپێدەی بەیانیەوە تا خۆرئاوا بوون خوای گەورە دەفەرموێ: (فَالآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُواْ مَا كَتَبَ اللّهُ لَكُمْ وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّواْ الصِّيَامَ إِلَى الَّليْلِ) ٢ البقرة / ١٨٧ واتە: ئێستا دەتوانن بچنە لای خێزانەكانتان وئەو لەزەتەیان لێ بكەن كە خوای گەورە بۆی دیاری كردوون، بشخۆن و بشخۆنەوە، تا دەزووی ڕەش و سپێتی سپێدەی ئاسمانتان بۆ ڕوون دەبێتەوە، ئینجا ڕۆژووەكەتان تا ئێوارە بەردەوام كەن.. مەبەست لە دەزووی سپێدە ڕوون بوونەوەی ئاسۆیە، كە فاسیلەی نێوان كۆتایی شەوو و سەرەتای ڕۆژە. ئەمە ئەو تەفسیرەیەتی، كە پێغەمبەر ﷺ كردویێتی. چونكە ئیمامی بوخاری و موسلیم دەگێڕنەوە كە عەدی كوڕی حاتەمی تەی ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ فەرموویەتی: كە ئەو ئایەتەی پێشوو هاتە خوارەوە، عەگالێكی ڕەش و عەگالێكی سپیم لە پشت سەرینەكەی خۆمەوە دانا بوو، پارشێو نانمان دەخوارد تا ئەو كاتەی ئەم دوو عەگالەم لێك جوێ دەكردەوە.. جارێك هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و ئەم كارەی خۆمم بۆ گێڕایەوە. كەچی ئەو فەرمووی: (إنما ذلك سوادُ الليلِ، وبياضُ النهارِ)[1].

---

[1] البخاري: كتاب الصوم – باب قول الله تعالى: (وكلوا واشربوا حتى يتبين لكم الخيط الأبيض) (٣ / ٣٦) وكتاب التفسير، باب: (قد نرى تقلب وجهك في السماء).. تا (عما تعملون) (٣ / ٣١)، ومسلم: كتاب الصيام – باب بيان أن الدخول في الصوم يحصل بطلوع الفجر، وأن له الأكل وغيره حتى يطلع الفجر...، برقم (٣٣و٣٤) (٢/٧٦٦و٧٦٧)، والترمذي: كتاب التفسير – باب ومن سورة البقرة، برقم (٢٩٧٠ و٢٩٧١)، وقال: هذا حديث حسن صحيح. وأبو داود: كتاب الصوم – باب وقت السحور، برقم (٢٣٤٩) (٢ / ٧٦٠، ٧٦١) والنسائي، مختصراً: كتاب الصيام – باب تأويل قول الله تعالى: (وكلوا واشربوا حتى يتبين لكم الخيط الأبيض من الخيط الأسود من الفجر) برقم (٢١٦٩) (٤/١٤٨).

٢ـ نییەت: واتە نیازی وا بێت، کە سبەینێ رەمەزانە بەرۆژوو بێت، هەروەها مەبەستی لە رۆژووەکە ئەوە بێت، کە پەرستنێکەو بۆ خوای گەورە ئەنجامی دەدات.. چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: (وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ) البينة / ٥ واتە: وایان فەرمان پێ کرا بوو کە غەیری خوا نەپەرستنو ئەویش سەرراستانەو خواوویستانە بپەرستن. پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: (إنما الأعمالُ بالنيَّات، وإنما لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى)[1] واتە: هەموو کردەوەیەك بە پێی نییەتەکەیەتی. هەر کەس جۆرە نییەتێکی هەیە.. زۆر لە زانایان دەفەرمون ئەم نییەت هێنانەش حەتمەن دەبێت لە شەوداو لە هەموو شەوەکانی رەمەزاندا بێت، پێش سپێدەی بەیانی. چونکە خاتوو حەفیە ـ خوا لێی رازی بێت ـ گێراوێتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ لَمْ يُجْمِعْ الصيامَ قَبْلَ الفَجْرِ، فَلا صيامَ لَهُ[2] رواه أحمد، وأصحاب السنن، وصححه ابن خزيمة، وابن حبان) واتە: هەرکەس نیەت و وویست و ئیرادەی رۆژوو گرتنی پێش سپێدەی بەیانی نەبوو بێت، رۆژووەکەی دروست نابێت.. هەندێك لە زانایانی دی فەرموویانە

---

[1] إنما الأعمال بالنيات. أي؛ إنما صحتها بالنيات، فالعمل بدونها لا يعتدبه شرعا/ البخاري: كتاب بدء الوحي (١ / ٢)، ومسلم: كتاب الإمارة – باب قوله صلى الله عليه وسلم: "إنما الأعمال بالنية" (٣ / ١٥١٥) حديث رقم (١٥٥)، وأبو داود: كتاب الطلاق – باب فيما عنى به الطلاق والنيات، برقم (٢٢٠١) (٢ / ٦٥١) والنسائي: كتاب الطهارة – باب النية في الوضوء (١ / ٥٨)، والترمذي: كتاب فضائل الجهاد – باب ما جاء فيمن يقاتل رياء وللدنيا، برقم (١٦٤٧) (٤ / ١٧٩)، وابن ماجه: كتاب الزهد باب النية (٢ / ١٤١٣)، والبيهقي (١ / ٤١) ومسند أحمد (١ / ٢٥، ٤٣، ٧٥، ٤٣٧).

[2] أبو داود: كتاب الصوم – باب النية في الصيام، برقم (٢٤٥٤) (٢ / ٨٢٣، ٨٢٤)، والترمذي: كتاب الصوم – باب ما جاء لا صيام لِمَنْ لمْ يعزم من الليل، برقم (٧٣٠) (٩٩/٣)، وقال أبو عيسى: حديث لا نعرفه مرفوعاً، إلا من هذا الوجه. والنسائي: كتاب الصوم – باب النية في الصوم، برقم (٢٣٣٦، ٢٣٣٧) (٤ / ١٩٧)، وابن ماجه: كتاب الصوم – باب في فرض الصوم من الليل والخيار في الصوم....، برقم (١٧٠٠) (٥٤٢/١)، والموطأ: كتاب الصيام – باب من أجمع الصيام قبل الفجر، برقم (٥) (١ / ٢٨٨)، والدارمي: كتاب الصوم – باب من لم يجمع الصيام من الليل (٢ / ٦)

ئەوە تەنها بۆ رۆژووی فەرزی رەمەزان (خودی رەمەزانەکە، یان گێڕانەوەی رۆژووەکەی) هەروەها بۆ رۆژووی واجیبە وەکو نەزرو کەفارەت..

**(کەوا بوو نییەت بۆ رۆژووی هەموو رۆژوویەکی فەرز پێویستەو دەبێت لە شەویشدا بهێنرێت)**

بشزانە کە هەر کەس لەبەر خاتری خوای گەورە، شەو بۆ پارشێو، بە هیوای بەرۆژوو بوونی سبەینێی هەستا، ئەوە نییەتەکەشی هێناوە.. هەر کەسێکیش لە رۆژدا بە مەبەستی رۆژوو گرتن خۆی لەو شتانە گرتەوە، کە رۆژوو دەشکێنن، ئەوە بەرۆژووە با پارشێویشی نەکرد بێت..

زۆر لە شەرعناسان فەرموویانە: ئەگەر کەسێك بۆ رۆژووی سوننەت لە رۆژدا پێش ئەوەی هیچ بخوات، بڕیاری دا بەرۆژوو بێت؛ ئەوەی بە نییەت بۆ حسێبە.. چونکە عائیشە ـ خوا لێی رازی بێت ـ دەگێڕێتەوە، کە جارێك پێغەمبەر ﷺ هاتە ماڵی ئەوو فەرمووی: (هَلْ عِنْدَكُمْ شَيءٌ؟)، واتە: هیچتان هەیە؟ (مەبەستی لە خۆراك بوو) ووتمان نەوەڵا. فەرمووی: (فَإِنِّي صائم، ثُمَّ أَتَانَا يَومَاً آخَرَ فَقُلْنَا: أُهْدِيَ لَنَا حَيْسٌ، فَقَالَ: أرينيه فَلَقَدْ أَيبَحْتُ صائماً، فَأَكَلَ)[1] رواه مسلم، وأبو داود. واتە: دەی مادام وایە من بەرۆژووم. کەچی رۆژێکی تر هاتەوە لامان ووتمان: ئەو خورماو رۆنەمان بۆ هاتووە، فەرمووی: ئادەی نیشانم دە، بەرۆژووش بووم، ئیتر خواردی..

حەنەفییەکان ئەوەیان بە مەرج داناوە، کە نییەتی رۆژوو گرتن دەبێت بکەوێتە پێش زەوال (نیوەڕۆ) دوە. ئەمەش رای بەناوبانگی شافیعییەکانیشە. فەتوای ئیبن مەسعودیش هەر وایە. ئیمام ئەحمەدیش دەفەرموێ: نییەتی رۆژوو بکەوێتە پێش

---

[1] مسلم: كتاب الصيام – باب جواز صوم النافلة بنية من النهار قبل الزوال... إلخ، برقم (٦٩) (٢ / ٨٠٨)، وأبو داود: كتاب الصوم – باب في الرخصة في ذلك، برقم (٢٤٥٥) (٢ / ٨٢٤)، والترمذي: كتاب الصوم – باب صيام المتطوع بغير تبييت، برقم (٧٣٣) (٣ / ١٠٢)، وابن ماجه: كتاب الصوم – باب فرض الصوم من الليل، برقم (١٧٠١) (١ / ٥٤٣)، والنسائي: كتاب الصيام – باب النية في الصيام، برقم ٢٣٢٧ (١٩٥/٤) وأحمد في "المسند" (٦ / ٢٠٧).

کاتی نیوەڕۆ یان دوای ئەو، گرنگ نییە. کەوا بوو ئەگەر پێش نیوەڕۆش نییەت بهێنێت هەر تەواوە، ئەمما ئەوەی کە دەڵێن دەبێت بە لەفز ووتبێتی: نییەتم هەیە سبەینێ بەرۆژوو دەبم بۆ خوای گەورە (الله اکبر) بەڵگەی لەسەر نییە، بە لەفز ووتنی هیچ نییە، چونکە نییەت لە دڵدایە، هەر بە دڵتدا هاتبێت، کە سبەینێ بە رۆژوو دەبیت، بەسە..

ئیمامی مالیك دەفەرموێ: هەر لە سەرەتاوە نییەت بهێنێت کە هەموو رەمەزانەکە بەڕۆژوو دەبێت، وەکو ئەوەیە هەموو شەوێك نییەتەکەی هێنا بێت، (ئەمە هەر بۆ رەمەزان نییە، بەڵکو بۆ رۆژووی کەفارەت و نەزرو قەتڵ و.. هتد یشە)بەڵام بەو مەرجەی رۆژووی مانگەکەی کەلێن تێ نەخستبێت بە سەفەر بە نەخۆشی بە حەیزو نیفاس، ئەگەر کەلێنی وای تێ کەوت دەبێت پێش دەست پێ کردنەوەی، نییەتی تری بۆ بهێنێتەوە.. بەلام ئیمامە بەرێزەکانی تری وەکو شافیعیو ئەحمەد دەفەرموون: نابێت، چونکە رۆژووی هەر رۆژێك خواپەرستیەکی سەربەخۆیەو عایدی رۆژێکی تر نییە، بۆیە هەر رۆژەو نییەتی خۆی دەوێت.. دیسان رایان لە هەندێك مەسەلەی تری لق و چڵدا جیاوازە، بەڵام ئەوەندە تەفسیلە لێرەدا پێویست نییە، ئەوەی پێویستە بیزانین ئەوەیە کە:

**(ئەگەر زانیمان رۆژووی سبەینێمان بە فەرز لەسەرە دەبێت شەو نییەتی رۆژوو گرتنەکەی بۆ بهێنین).**

# رۆژوو لەسەر کێ فەرزە؟

زانایان کۆکن لەسەر ئەمە، کە رۆژوو لەسەر هەموو موسوڵمانێکی ژیرو بالغ و لەش ساغ ونیشتەجێ فەرزە. بەڵام ئافرەت مەرجە، کە لە عوزری حەیزو زەیستانیدا نەبێت.

کەوا بوو رۆژوو لەسەر کافروشێت و منداڵ و ئەوی گەشتیارە (لە سەفەرە) و ئافرەتی حەیزدارو زەیستان و دووگیان و پیری پەك کەوتە نییە.

هەندێك لەوانە رۆژوویان هەر لەسەر نییە. وەکو شێت و منداڵ. دەربارەی هەندێکی تریان زانایان دەڵێن: دەبێت سەرپەرشتیارەکانیان داوایان لێ بکەن تا بەرۆژوو بن. هەندێکی تریان دەبێت هەم رۆژووەکە بگرنەوە، هەم دەبێت کەفارەتیشی بدەن. هەندێکی تریان رێ دەدرێن نەیگرن، بەڵام دەبێت کەفارەتەکەی بدەن. وا لە خوارەوەش باسی هەر پۆلێکیان بە جیا دەکەین:-

**رۆژووی کافرو شێت:** رۆژوو خواپەرستییەکی ئیسلامییە، بۆیە لەسەر غەیری موسوڵمانان فەرز نییە. لەبەر ئەوەی ئەحکامی ئیسلامیش پەیوەستە بە ژیرییەوە، شێت تەکلیفی شەرعی لەسەر نییە. عەلی کوڕی ئەبو تالیب ـ خوا لێی رازی بێت ـ دەگێڕێتەوەکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (**رُفِعَ القلمُ عن ثلاثٍ: عن النائِمِ حتَّى يَسْتَيقِظَ، وعن الصبِي حتَّى يَحْتَلِمَ، وعن المجنونِ حتى يَعْقِلَ**)[1] رواه أحمد، وأصحاب السُنن، والحاكم، وقال: صحيح على شرط الشيخين، وحسّنه الترمذي) واتە: قەڵەم

[1] أبو داود: كتاب الحدود باب في المجنون يسرق أو يصيب حدّاً، برقم (٤٤٠٣) (٤ / ١٣٩) والترمذي: كتاب الحدود عن رسول الله صلى الله عليه وسلم باب ما جاء فيمن لا يجب عليه الحد برقم (١٤٢٣)، (٤ / ٣٢) وابن ماجه: كتاب الطلاق – باب طلاق المعتوه والصغير، والنائم (٢ / ٦٥٨) برقم (٢٠٤١) ومسند أحمد (٦ / ١٠٠، ١٠١) ومستدرك الحاكم (٢ / ٥٩) وقال: هذا حديث صحيح على شرط البخاري ومسلم ولم يخرجاه والدارمي (٩٣/٢) (كتاب الحدود – باب رفع القلم عن ثلاث.)

نەسەر سێ کەس هەڵگیراوە (یەعنی حوکمیان لەسەر نەماوەو شەرع داوای هیچیان لێ ناکات) لە شێت تا ژیریی بۆ دەگەڕێتەوە، خەوتوو تا هەڵدەستێت، منداڵ تا باڵغ دەبێت..

**ڕۆژوی منداڵ:** منداڵ ئەگەرچی ڕۆژووی لەسەر فەرز نییە، بەڵام ئەگەر دەیتوانی بەڕۆژوو بێت، دەبێت کەس و کارو سەرپەرشتیارانی پێی بگرن تا را بێت لەسەر گرتنی. چونکە روبەییعی کچی موعەووەذ ـ خوا لێی رازی بێت ـ گێڕایەوە کە (**أرسَلَ رسُولُ اللّه ﷺ صبيحَةَ عاشوراء إلى قُرى الأنصار: مَنْ كانَ أصبحَ صائماً، فَليُتمَّ صومَهَ، ومَنْ كانَ أصبحَ مُفطِراً، فَلْيَصمْ بقيَّةَ يومِه. فَكُنَّا نَصومُهُ بعدَ ذلك، ونُصومِّ صبيانَنا الصغارَ منهم، ونَذهبُ إلى المسجدِ، فنجعلُ لهمْ اللُّعْبَةَ مِنْ العِهْنِ، فإذا بكى أحدُهُمْ من الطعامِ، أعطيناهُ إياهُ، حتى يكونَ عندَ الإفطارِ**[١] رواه البخاري، ومسلم. واتە: پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ دەرکەوتنی بەیانی عاشورادا جوابی نارد بۆ پشتیوانەکان کە هەر کەس بەڕۆژوو بوو بێت با ڕۆژووەکەی خۆی تەواو کات، ئەوی شکاندووشیەتی با تا بەربانگ هیچ نەخوات. ئێمەش هەموو بەڕۆژوو بووینەوەو منداڵەکانیشمان پێ کرد (وامان لێ کردن بەڕۆژوو بن) بردمانن بۆ مزگەوت، یاریمان لە خووری بۆ دروست کرد بوون، بۆ ئەوەی هەژ یەکێکیان، کە لە برسان گریا بەو یارییانە ژیریان کەینەوە. ئاوا تا بەربانگ .

**ئەوی بەڕۆژوو نابێت و کەفارەت دەدات:** ئەو ژن و پیاوەی لەبەر پیری بێ توانا بوون (جگە لەوانەی خەڵەفاون و تەکلیفیان لەسەر نەماوە) هەروەها ئەو نەخۆشەی لە چاك بوونەوە بێ ئومێد بووە، ئەو کەسانەی پیشەو کاسبیان زۆر قورسە، ئەو کەسانەی لەبەر کەسابەت و ئیش هێنەدیان کات بەدەستەوە نییە، ئەمانە هەموویان، ئەگەر زانییان ڕۆژوو گرتن گەر لە هەر کاتێکی چوار وەرزەی

---

[١] البخاري: كتاب الصوم – باب صوم الصبيان(٣/٤٧ـ٤٨) ومسلم: كتاب الصيام – باب من أكل في عاشوراء، فليكفّ بقية يومه، برقم (١٣٦،١٣٧) (٢/٧٩٩،٧٩٨).

ساڵدا بیگرن، ماندوویان دەکات مافی ئەوەیان هەیە بەرۆژوو نەبن. لە جێی نەگرتنەکەی دەبێت تا رەمەزان تەواو دەبێت، رۆژی هەژارێك تێر کەن..

پێوەری تێر کردنی هەژارێکی ئەوسا (صاع) ی پێغەمبەر بووە ﷺ کە چوار مودد بووە، هەر موددێك ٦٢٥ گرامی ئێستای ئێمەیە، کەوا بوو کە دەڵێن ساعی پێغەمبەر ﷺ یەعنی ٣٠٠٠ گرام (٣ کیلۆ). کەوا بوو کە دەڵێن: دەبێت ساع و نیوێك دانەوێڵەی وەکو گەنم و جۆ، خورما، برنج.. بداتە هەژارێك [1].

ئیبنو عەبباس ـ خوا لێیان رازی بێت ـ دەفەرموێ: (رُخِّص للشيخ الكبير، أن يُفطِرَ ويُطْعِمَ عن كلِّ يومٍ مِسْكِيناً، ولا قضاءَ عليه) [2] رواه الدارقطني، والحاكم وصححاه) واتە: پیری بێ توانا مۆڵەتی ئەوەی دراوەتێ کە بەرۆژوو نەبێت، بەڵام لە جیاتی هەر رۆژێکیدا هەژارێك تێر کات، رۆژوودکەش ناگرێتەوە [3].

---

[1] لە زەمانی ئێستای ئێمەدا ئەم پێوەرە زۆر بەکارنایات،، دەبێت بە پارە یان بە تێکرای ژەمە خواردنێکی بازارِ دیاری بکرێت. بۆ نموونە لە کوردستانی خۆمان شلەو برنجێك، یان دوو شیش کەبابی ئاسایی پێوەرێکی شیاوە. بۆ ئەوانەی لە رۆژئاواشن، پێم وایە ئێستا پارەی ژەمە خواردنێکی چێشتخانەکانی ماکدۆناڵد (هەرچەند ئەو پێوانەشمان پێ خۆش نەبێت) لە هەموو جیهاندا ـ بە تایبەتی لە رۆژ ئاواو وولاتە سەرمایە دارەکانادا ـ پێوەرێکی گونجاو بێت..

**تێبینی:** ناشێت کابرا لە نەرویج بژی بەڵام ژەمە پێوەری کوردستان، یان ژەمە ماکدۆناڵی ئەلبانیا حسێب بکات.. با ئەوەندە رەزیل نەبێت، با لە هەر کوێیەك دەژی، کەفارەتەکە بە پارەی ئەوێ حسێب بکات، بەڵام با بەخشینەوەی پارەکە و تێرکردنی هەژارەکان لە کوردستان، یان لە وولاتێکی تری هەژار بێت. تا زۆرترین رێژە هەژاری پێ تێر بکرێت و پاداشتەکەش بێگومان زۆرتر دەبێت..

[2] **الدارقطني: كتاب الصيام – باب طلوع الشمس بعد الأفطار، برقم وقال: وهذا إسناد صحيح (٢ / ٢٠٥)، والحاكم: كتاب الصوم (١/٤٤٠) وقال: هذا حديث صحيح على شرط البخاري، ولم يخرجاه، وفيه الدليل. ووافقه الذهبي.**

[3] شێخی ئەلبانی رەحمەتی دوای ئەوەی ئەم حەدیسەی بە زۆر رێگا و سەنەدی جیاواز هێناوەتەوە فەرموویەتی: **(حديث ابن عباس يدل على ان العاجز عن الصيام لكبره أو مرض مزمن يطعم عن كل يوم مسكينا، وهذا صحيح يشهد له حديث ابن عمر وأبي هريرة).**

ئیمامی بوخاری لە عطاء ەوە دەگێڕێتەوە[١] کە گوێی لە ئیبنو عەبباس بووە کە ئەم ئایەتەی خوێندۆتەوە: (وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ)٢ البقرة/١٨٤ واتە: ئەمما ئەو کەسانەی کە ڕۆژووەکە ناگرن و دەتوانن کەفارەتی بدەن، کەفارەتی هەر ڕۆژێکی بە خواردن بەخشینە بە هەژارێك. پاشان فەرمووی: حوکمی ئەم ئایەتە نەسڕاوەتەوە. ئەمە حوکمی پیاوی پیرو پیرێژنە کە ناتوانن بەڕۆژوو بن، بۆیان هەیە کەفارەتەکەی بدەن، ڕۆژانە دەبێت ژەمە خوارنێك بدەن بە دەسکورتێك. (لە مەزهەبی ئیمامی مالیك و ئیبنو حەزمدا نە ڕۆژووەکە دەگرن نەکەفارەتەکەش دەدەن).

هەروەها ئەو نەخۆشەی کە ئومێدی نەماوە چاك بێتەوە و دەشزانێت ڕۆژوو ماندووی دەکات، حوکمی ئەمیش وەکو هی پیرەکان وایە. هەروەها ئەو کرێکارانەش کە ئیشی قورس دەکەن. چ خودی کاسبیەکانیان قورس بێت، وەکو بەردهەڵکەندن و قیرڕێژیی و سایەقی تەکسی و لۆری و.. هتد، چ لە شوێنی قورسدا بن، وەکو سەپان و ئاسنگەرو لەبغکاری بەر ڕۆژ و.. هتد..

شێخ محمد عەبدە دەفەرموێ: مەبەست لە (يُطِيقُونَهُ: ئەوانەی دەتوانن) پیری بێ تواناو نەخۆشی هەمیشەیی و ئەو جۆرانەی وەکو ئەوانیشن، وەك ئەو کاسبکارانەی خوای گەورە رزق و ڕۆزی خستوونەتە سەر کاری قورس و ناڕەحەتی وەکو ئیش لە کانەبەردەکان و دەرهێنانی خەڵوزی بەردین و ئەوانە... ئەمە ئەو تاوانبارانەش دەگرێتەوە کە لە زینداندان و حوکمی (زیندان و کاری قورس)یان بەسەردا دراوە. بەو مەرجەی نەتوانن بەڕۆژوو بن و پارەشیان ئەوەندە نەبێت کە کەفارەتەکەی بدەن..

---

[١] البخاري: كتاب التفسير – تفسير سورة البقرة (٦ / ٣٠)، وأبو داود: كتاب الصوم – باب من قال: هي مثبتة للشيخ والحبلى، برقم (٢٣١٧، ٢٣١٨)، والبيهقي: كتاب الصيام – باب الحامل والمرضع (٤ / ٢٣٠)، والدارقطني: كتاب الصيام – باب طلوع الشمس بعد الإفطار، برقم (٣) (٢٠٥/٢) والحاكم: كتاب الصوم (١ / ٤٤٠) وقال: هذا حديث صحيح على شرط الشيخين، ولم يخرجاه. ووافقه الذهبي

هەروەها ئافرەتی دووگیان و دایەنی شیردەریش ئەگەر مەترسیان لەوە هەبوو کە رۆژوو کارتێکردنی سلبی دەبێت لەسەر خۆیان یان لەسەر کۆرپەو ساواکانیان. (کە بە تەجروبەی خۆیان یان بە شایەتی پزیشکی پسپۆڕو جێ متمانە بۆیان روون دەبێتەوە) دەتوانن رۆژوو نەگرن. بەڵام کەفارەتەکەی دەدەن. لەسەر رای ئیبنو عومەرو ئیبنو عەبباس گرتنەوەی رۆژووەکەیان لەسەر نامێنێت.

ئەبو داود لە عیکریمەوە دەگێڕێتەوە کە ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: ئایەتی (**وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ**) مۆڵەتە بۆ ژن و پیاوی پیرو بەساڵدا چوو، کە ناتوانن رۆژوو بگرن، تا نەیگرن. لە جێی ئەوە دەبێت کەفارەتەکەی بدەن کە بەخشینی ژەمە خۆراکێکە بۆ دەست کورت و هەژاران. هەروەهاشە بۆ دووگیان و دایەنی شیر دەر ئەگەر مەترسییان هەبوو (واتە لەسەر خۆیان یان لەسەر کۆرپەو ساواکانیان) رواه البَزّار[1] بەززار گێڕاوێتیەوەولە کۆتاییشدا دەفەرموێ: ئیبنو عەبباس بە خێزانی خۆی ـ کە کۆرپەی ساوای هەبوو ـ دەفەرموو: (**أنتِ بمنزلةِ الذي لا يُطيقُهُ، فعليكِ الفداءُ، ولا قَضاءَ عَلَيكِ**)[2] واتە: تۆ لە ریزی ئەو کەسانەدایت کە ناتوانن بەرۆژوو بن. بۆیە هەر کەفاردتەکەت لەسەرد، نەك گرتنەودشی. صحيح الدارقطني إسناده..

نافیعیش دەگێڕێتەوە کە دەربارەی رۆژوو نەگرتنی ئافرەتی دووگیانیان لە ئیبنو عومەرـ خوا لێیان رازی بێت ـپرسی، ئەگەر مەترسی لەوە هەبوو کە رۆژووەکە بۆ کۆرپەکەی خراپ بێت. لە وەڵامدا فەرمووی: (**تُفطِرُ، وتُطعِمُ مكانَ كُلِّ يومٍ مِسْكيناً مُدّاً**) رواه مالك والبيهيقي[3] واتە رۆژوو ناگرێت، بەرامبەر ئەوە رۆژانە موودێك دەداتە هەژارێك(لەو زەمانەدا بە سێ چارەکی پەرداخێك گەنم تەقدیر

---

[1] أبو داود: كتاب الصوم – باب من قال: هي مثبتة للشيخ والحبلى، برقم (٢٣١٨) (٢ / ٧٣٨)، والبيهقي: كتاب الصيام – باب الحامل والمرضع (٤ / ٢٣٠).

[2] الدارقطني: كتاب الصيام – باب طلوع الشمس بعد الإفطار، برقم (٨) (٢ / ٢٠٦).

[3] الموطأ: كتاب الصيام – باب فدية من أفطر في رمضان من علة، برقم (٥٢) (١ / ٣٠٨)، والبيهقي: كتاب الصيام – باب الحامل والمرضع (٤ / ٢٣٠).

کراوە چونکە دەیکردە دوو ژەم خواردنی هەژارێك، زەمانی ئێستای ئێمە ژەمە خواردنێکی ئاساییە لە چێشتخانەی بازار).

لە حەدیسی تردا هاتووە کە: (إنَّ اللّهَ وَضَعَ عَنْ المُسافِرِ الصومَ، وشَطْرَ الصلاةِ، وعنِ الحُبْلَى والمُرضِعَ الصوم)[١] واتە: خوای گەورە رۆژوو گرتن و نیو نوێژی لەسەر ئەو کەسە هەڵگرتووە کە سەفەر دەکات، لەسەر دووگیان و دایەنی شیردەریش رۆژووەکەی هەڵگرتووە. لە مەزهەبی حەنەفی و لای ئەبو عوبەیدو ئەبو ثور وایە کە ئەوانە تەنها رۆژووەکە دەگرنەوە نەك کەفارەت دانیش.. بەڵام لای ئیمامی ئەحمەد و ئیمامی شافیعی ئەوەیە: ئەگەر مەترسییان لەسەر تەندروستی کۆرپەو ساوایانیان هەبوو رۆژوو ناگرن. بەڵام دوایی دەبێت هەم رۆژووەکە بگرنەوەو هەم کەفارەتەکەش بدەن. ئەمما ئەگەر مەترسییان تەنها لە تەندروستی خۆیان هەبوو، یان لە تەندروستی خۆشیان و کۆرپەو ساواکانیشیان بوو، ئەوە تەنها رۆژووەکە ـ لە کاتێکی تردا ـ دەگرنەوەو کەفارەت نادەن..

**ئەوی بۆی هەیە پێ نەبێت دوایی دەبێت بیگرێتەوە:** ئەوی نەخۆشیەکی وای هەیە کە ئومێدی چاك بوونەوەی هەیە، هەروەها ئەوی لە رەمەزانەکەدا لە سەفەردایە مۆڵەتی ئەودیان دراوەتێ، کە بەرۆژوو نەبن، بەڵام دەبێت دوایی بیگرنەوە. چونکە خوای گەورە فەرموویەتی: (وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ) ٢ البقرة /١٨٥، واتە: هەر کەس نەخۆش بوو یان لە سەفەردا بوو دەبێت لە رۆژانی تردا بیگرێتەوە..

---

[١] أبو داود: كتاب الصوم – باب اختيار الفطر، برقم (٢٤٠٨) (٢ / ٧٩٦، ٧٩٧)، والنسائي: كتاب الصيام - باب وضع الصيام عن المسافر، وذكر اختلاف معاوية بن سلام، وعلي بن المبارك في هذا الحديث برقم (٢٢٧٥) (٤ / ١٨٠) وباب وضع الصيام عن الحبلى والمرضع برقم (٢٣١٥)(٤/١٩٠) والترمذي: كتاب الصوم – باب الرخصة في الإفطار للحبلى والمرضع برقم ٧١٥ (٨٥/٣) م، وقال: حديث حسن، وابن ماجه: كتاب الصيام، حديث رقم (١٦٦٧)، وأحمد في" المسند" (٤ / ٣٤٧، ٥ / ٢٩)

ئیمامی احمد و ئەبوداوودو بەیهەقی بە سەنەدی سەحیح لە مەعازی کوڕی جەبەلەوە ـ خوا لێی رازی بێت ـ گێڕاویانەتەوە، کە فەرموویەتی: (إن اللّه تعالى فرض على النبي ﷺ الصيام، فأنزل: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصيامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ) إلى قوله: (وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ) البقرة/١٨٣ـ ١٨٤ فكان من شاء صام، ومن شاء أطعم مسكيناً، فأجزأ ذلك عنه، ثم إن اللّه _ تعالى _ أنزل الآية الأخرى: (شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ) إلى قوله: (فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ)٢ البقرة /١٨٥فأثبتَ صيامه على المقيم الصحيح، ورخص فيه للمريض والمسافر، وأثبت الإطعام للكبير، الذي لا يستطيع الصيام)[١] واتە: خوای پەروەردگار رۆژووی لەسەر پێغەمبەر ﷺ بەوە فەرز کرد، کە فەرمووی: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە رۆژووتان لەسەر فەرز کراوە هەروەکو، کە لەسەر ئەوانەی پێش ئێوە فەرز کرابوو، تا بە هۆیەوە پارێزکاری بکەن. تا دەگاتە: لەسەر ئەوانەش (کە ناتوانن رۆژووەکە بگرن بەڵام) کە دەتوانن کەفارەت بدەن با ژەمە خواردنی هەژارێك بدەن ئینجا هەرکەس دەیویست بەرۆژوو دەبوو، ئەوی نەشی دەتوانی ژەمە خواردنەکەی دەدایە هەژارێك (کەفارەتەکەی دەدا) ئەویشی بۆ دەکەوتە بری رۆژووەکە. پاشان خوای گەورە فەرمووی: مانگی رەمەزان ئەو مانگەیە کە قورئانی تێدا هاتۆتە خوارەوە.. تا گەیشتە: هەر کەستان ئامادەی مانگەکە بوو (واتە رەمەزانی هاتەوە سەر، یان گەیشتەوە مانگی رەمەزان) با بەرۆژوو بێت.. بەمەش رۆژووەکەی لەسەر نیشتەجێی لەش ساغ فەرز کردو مۆڵەتی نەخۆش و موسافیری دا کە نەیگرن. هەروەها ئەوەشی دیاری کرد، کە ئەو پیری بێ توانایەی ناتوانێت پێ بێت، بۆی هەیە نەیگرێت، بەڵام دەبێت کەفارەتەکەی بدات..

---

[١] أبو داود: كتاب الصلاة – باب كيف الأذان برقم (٥٠٦) (٣٤٧/١) أحمد في "المسند (٥ / ٢٤٦،٢٤٧).

ئـەو نەخۆشییەی کـە مۆڵـەت بـە خاوەنەکـەی دەدات رۆژوو نـەگرێت، ئـەو نەخۆشییە سـەختەیە کە بە رۆژوو گرتن زیاد دەکات، یـان مەترسـی ئـەوە هەیـە ببێتە هۆی دردنگ چاك بوونەوەی نەخۆشییەکە (**ئەمەش عادەتـەن بـە تەجروبـە دەزانرێت یان پزیشکی شارەزاو متمانە پێ کراو شایەتی بۆ دەدات**).

ئیبنو قودامە لە کتـێبی **المغْنـي** دا دەفـەرموێ: زانـای سـەلەف هـەن، کـە مۆڵـەتیان بـە هـەموو نەخۆشـێك داوە رۆژوو نـەگرێت، بـا دان ئێـشەیەك یـان ئازارێکیش بێت لە پەنجەیەکدا! چونکە ئایەتەکە بە گشتی دەفەرموێ: هەر کـەس نەخۆش بـوو؟ مـادام بـۆ موسـافیریش هەیـە رۆژوو نـەگرێت -بـا سەفەرەکەشـی پێویست نەبوو بێت- کەوا بوو بۆ نەخۆشـیش هـەر وایـە بـا نەخۆشیەکەشـی زۆر سەخت نەبێت.. ئەمەش فەتوای بوخاری وعطاء و زاهیریەکانە..

حوکمی ئەو کەسەی لەشی ساغە، بەڵام دەترسـێت ئەگـەر رۆژوو بگرێـت بـۆ تەندروستی خراپ بێتهەر وەکو نەخۆش وایە. هەروەها ئەو کەسەش کە بـەرۆژووە، بەڵام تینوێتی یان برسێتی تینی بۆ هێناوەو دەترسێت گەر بەردەوام بێت بمرێت، بـا لەش ساغیش بێت، بۆی هەیە رۆژووەکەی بشکێنێت و لە کاتی تردا بیگرێتـەوە.. چونکە خوای گەورە دەفەرموێ (**وَلاَ تَقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيماً**) ٤ **النساء/٢٩**، واتە: خۆتـان مـەکوژن، خـۆ خـوای گـەورە بەبەزەییـە بەرامبـەرتان. هەروەها دەفەرموێ: (**وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ**) **٢٢ الحج/٧٨**، واتە: خـوای گەورە هیچ نارەحەتیو گرێو گۆڵیەکی لە دینو دینداریەکەدا بۆ پێش نەهێناون.

ئەگـەر نەخۆشـێك هـەر سـوور بـوو لەسـەر رۆژوو گرتنەکـەی و تەحـەمولی نارەحەتیەکەی کرد، رۆژووەکەی تەواوە، بەڵام کارێکی چـاکی نـەکردووە، چـونکە سوودی لەو مۆڵەتە وەرنەگرتووە، کە خوای گەورە بۆ نەخۆشـی دانـاوە، لەوانەشـە تووشـی نەخۆشی تربیێت، یا نەخۆشیەکەی خۆی خراپتر ببێت.

لە یاوەرانیشدا زۆر جار بووە، کە هەندێکیان بەرۆژوو بوون و هەندێکی تریـان بەرۆژوو نەبوون. هەردوولاشیان هەر لەسەر فەتوای پێغەمبـەری مـەزن بـوون ﷺ

حەمزەی ئەسلەمی ـ خوا لێی رازی بێت ـ بە پێغەمبەری ﷺ فەرموو: (يا رسولَ اللّهِ، أجِدُ منِّي قُوةً علَى الصوم فِي السَّفَرِ، فهلْ عليَّ جُناحٌ؟ فقال: هـي رُخـصةٌ مِن اللّهِ _ تعالى _ فَمَنْ أخَذَ بهَا، فحَسَنٌ، ومَـنْ أحَـبَّ أن يـصومَ فـلا جُنـاحَ عليه[1]. رواه مسلم واته: توانـای رۆژوو گـرتنم لـە سـەفەریـشدا هـەر هەیـە، ئەگـەر بەڕۆژوو بم گوناحبار دەبم؟ فەرمووی: ئەوە خـۆی مۆڵەتێکـەو خـوا داوێـتی، هـەر کەس وەری گرێ ئەوە کارێکی چاکە، هەر کەسێکیش هەر حەز کات بەڕۆژوو بێـت گوناحی ناگاتێ..

ئەبو سەعیدی خودریش ـ خـوا لێـی رازی بێـت ـ دەفـەرموێ: (سـافَرْنَا مـع رسول اللّه ﷺ إلى مكّةَ، ونحنُ صيامٌ. قالَ: فَنَزَلنْا مَنزلاً، فقالَ رسولُ اللّه ﷺ: إنَّكُمْ قَدْ دَنَوتُمْ منْ عَدُوِّكُمْ، والفِطرُ أقوى لَكُمْ". فكانتْ رُخْصةً، فَمنّا مَنْ صـامَ، ومنَّا مَنْ أفْطَرَ، ثمَّ نزلْنَا منزِلاً آخَرَ، فقالَ: إنَّكُمْ مصبِّحو عَدوِّكم، والفطْرُ أقـوى لَكُمْ، فأفطِروا فكانتْ عَزْمَةً، فأفطَرْنَا، ثمّ رأيتَنا نَصومُ بعدَ ذلكَ معَ رسـولِ اللّـه ﷺ في الـسَّفَرِ[2]. رواه أحمد، ومسلم، وأبـو داود) واتـە: بـەڕۆژوو بـووین لـە خزمـەت پێغەمبەردا ﷺ سەفەرمان کرد بۆ مەککە، لە شـوێنێك لامانـدا. پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: ئێـوە وا لـە دوژمنـەکانتان نزیـك بوونەتـەوە، بـۆ بـەهێز بوونتـان رۆژووەکانتان بشکێنن چاکترە. ئەمەش مۆڵەتێك بوو. ئیتر هـەمان بـوو بـەردەوام بوو لەسەر رۆژووەکەی و هەشمان بوو شکاندی. دوایی لە شوێنێکی تریش لامانـدا، فەرمووی: ئێوە وا نزیکە بگەنە سەر دوژمنەکانتان، بۆیە رۆژوو شـکاندن چـاکترە.

---

[1] مسلم: كتـاب الـصيام – بـاب التخـيير في الـصوم والفطـر في الـسفر، بـرقم (١٠٧) (٢ / ٧٩٠) والنسائي: كتاب الصيام – باب ذكر الاختلاف على عروة في حـديث حمـزة فيـه، بـرقم (٢٣٠٣) (٤ / ١٨٦، ١٨٧)، والبيهقي: كتاب الصيام – باب الرخصة في الصوم في السفر (٤ / ٢٤٣).

[2] مسلم: كتاب الصيام – باب أجر المفطر في السفر إذا تولى العمـل بـرقم (١٠٢) (٢ / ٧٨٩) وأبـو داود: كتاب الصوم - باب الصوم في السفر، برقم (٢٤٠٦) (٢ / ٧٩٥)، وأحمد في "المسند" (٣ / ٣٥).

ئیتر هەمووومان رۆژووەکەمان شکاند. پاش ئـەوە دیتـت لـە سـەفەرەکەدا لەگـەڵ پێغەمبەر ﷺ بەرۆژوو دەبووینەوە.

هەر ئەو ـ خوا لێی رازی بێـت ـ دەفـەرموێ: (وعـنْ أبـي سَعيدٍ الخُدْري ـ رضي اللّهُ عنهُ ـ قالَ: كُنَّا نَغْزُو مَعَ رسولِ اللّه ﷺ في رمضانَ، فَمِنَّـا الـصائمُ، ومنَّا المُفْطرُ، فلا يَجِدُ الصائمُ على المفطرِ، ولا المُفْطِر على الـصائمِ، ثـمَّ يـرونَ أنَّ مَنْ وَجَدَ قوةً فَصامَ، فإنَّ ذلكَ حَسَنٌ، ويَرَونَ أنَّ مَنْ وَجَدَ ضَعفاً فأفْطَرَ، فإنَّ ذلكَ حَسَنٌ[١] رواه أحمد، ومسلم واته: لە غەزایەکدا لە خزمـەت پێغەمبـەردا بـوو ﷺ هەمان بوو بەرۆژوو بوو، هەشمان بوو پێ نەبوو. کەسیش تیرو تانەی لە کەسـی تـر نەدەگرت. پاشان بینییان ئەوی بەهێز بوو و بەرۆژوو بـوو چـاکی کـرد، ئـەوی بـێ هێزیش بوو رۆژووەکەی شکاند بوو، هەر چاکی کرد..

زانایان موناقەشەیان لەسەر ئەوەیە کە کام هەڵوێستە لەوی تر چاکترە؟

ئیمامان ئەبو حەنیفەو شافیعی و مالیك دەفـەرموون: بـۆ کەسـێك بـە توانـا بێت، رۆژوو گرتنەکـە چـاکترە، بـۆ کەسـێکیش بـێ هێـزو لاواز بێـت شـکاندنی چاکترە.. بـەڵام ئیمـام ئەحمـەد دەفـەرموێ: رۆژوو نەگرتنەکـە یـان شـکاندنەکەی چاکترە. عومەری کوڕی عبـد العزیـز ـ رەحمـەتی خـوای لـێ بێـت ـ دەفـەرموێ: کامیانی لا ئاسانتر بوونەوەیان چاکترە. ئەوی رۆژوو گرتنەکەی پێ چاکتر بێت وەك لە گرتنەوەی دوایی تر، ئەوە ئێستا بیگرێت چاکترە..

ئیمامی شـەوکانی ـ دوای توێژینـەوەو وورد بوونـەوە ـ دەفـەرموێ: هـەر کـەس رۆژووەکەی لەسەر قورس بێت، یان زیـانی پـێ بگـەێنێت، یـان نەیـەوێت مۆڵەتەکـە

---

[١] مسلم: كتاب الصيام – باب جواز الصوم والفطر في شهر رمضان للمسافر، في غير معصية. برقم (٩٦) (٢ / ٧٨٧)، والترمذي: كتاب الصوم – باب ما جاء في الرخصة في السفر، برقم (٧١٣) (٣ / ٨٣)، وقال: هذا حديث حسن صحيح، وأحمد في "المسند" (٣ / ١٢) والبيهقي: كتاب الصيام – باب من اختار الصوم في السفر إذا قوي على الصيام (٤ / ٢٤٥)

وەرگرێت، یان لە ریابازی و خۆپەسەندی نەفسی خۆی ترسا ـ ئەگەر لە سەفەردا بوو ـ چاکترە بەرۆژوو نەبێت. هەر کەسیش ئەوانەی نەبوو، رۆژوو گرتنەکەی چاکترە..

ئەگەر کەسێکی موسافیر بە ئومێدی رۆژوو گرتن پارشێو هەستا بوو، بەلاّم بۆ سبەی سەفەری کرد، بۆی هەیە رۆژووەکەی بشکێنێت.. چونکە جابری کوری عبد الله ـ خوا لێی رازی بێت ـ گێرایەوە کە (أنَّ رسولَ اللّه ﷺ خَرَجَ إلى مَكَّةَ عامَ الفتحِ فَصامَ، حتى بَلَغَ كُرَاعِ الغَمِيمِ، وصامَ الناسُ مَعَهُ، فقيلَ لَهُ: إنَّ النَّاسَ قَدْ شَقّ عليهِمْ الصيامُ، وإنَّ الناسَ ينظرونَ فيما فَعَلْتَ. (فَدَعَا بِقَدَحٍ مِنْ ماءٍ بَعْد العَيْرِ فَشَرِبَ)، والناسُ ينظرونَ إليه أفطَرَ بَعْضُهُم وصامَ بعضُهم، فَبَلَغُهُ أنَّ ناساً صامُوا فقالَ: (أولئكَ العُصاةُ)[١] رواه مسلم، والنسائي، والترمذي وصححه واته: پێغەمبەر ﷺ لە ساڵی هەشتەمی کۆچی کە بەرەو مەککە دەچوو، بەرۆژوو بوو، خەڵکەکەش کە لە خزمەتیدا بوون هەر بەرۆژوو بوون. کە گەیشتە دۆڵی (کُراع الغَمیم)[٢] پێیان ووت: رۆژووەکە لەسەر خەڵکەکە قورس بووە، ئەوانیش هەر سەیری جەنابت دەکەن چی دەکەیت. ئەویش داوای پەرداخێك ئاوی کرد، دوای عەسریش بووخەڵکەکەش سەیریان دەکرد. بەرزی کردەوەو خواردییەوە، ئیتر خەڵکیش رۆژووەکەیان شکاند، کەچی هەندێ کەس هەر بەردەوام بوون لەسەر رۆژووەکە! کە هەواڵەکەی گەیشتێ، فەرمووی: ئەوانە تاوانبارن، ئەوانە تاوانبارن.. مەبەستی لە تەئکید کردنەوەی سەرزەنشت کردنیان بوو کە بۆچی سەرپێچی فەرمانی ئەمیان کردووە..

---

[١] مسلم: كتاب الصيام – باب جواز الصوم والفطر في شهر رمضان للمسافر في غير معصية برقم (٩٠) (٢ / ٧٨٥)، والترمذي: كتاب الصوم – باب ما جاء في كراهية الصوم في السفر، برقم (٧١٠) وقال: حديث حسن صحيح(٣/٨١ و٨٢) والنسائي: كتاب الصيام – باب ذكر اسم الرجل، برقم (٢٢٦٣) (٤ / ١٧٧)، والبيهقي: كتاب الصيام – باب المسافر يصوم بعض الشهر، ويفطر بعضاً، ويصبح صائماً في سفره، ثم يفطر ٤/ ٢٤٦.

[٢] دۆڵێکە کەوتۆتە نێوان مەککە و مەدینەوە ٦٤ کم لە مەککەوە دوورە، ئێستا پێی دەڵێن برقاو الغميم، لە دۆڵی عەسەفانەوە دەست پێ دەکات بە دەریای سوور کۆتایی دێت، لە باکوری رۆژئاوای شاری جەددەوەیە.

ئەگەر كەسێك خۆی نیشتەجێ بوو، نیيەتی رۆژووی هێنا، پاشان لە رۆژدا سەفەری كرد، جمهوری زانایان دەفەرموون: بۆی نییە بیشكێنێت ئیمامی ئەحمەد و ئیسحاق فەرموویانە: بۆی هەیە بیشكێنێت.. چونكە ترمذي لە محمدی كوڕی كەعبەوە دەگێڕێتەوە، كە فەرموویەتی: (أتيتُ في رمضان أنسَ بنَ مالك، وهو يريد سفراً، وقد رُحِّلتْ له راحلته، ولبس ثياب السفر، فدعا بطعام فأكل، فقلت له: سُنّة؟ فقال: سنة. ثم ركب)[١]، واتە: رەمەزان بوو هاتمە لای ئەنەسی كوڕی مالیك، بە هیوای سەفەر بوو، جل و بەرگی سەفەری لەبەر كرد بوو، وولاخێكیشی ئامادە كرد بوو، پێش دەرچوون، داوای خواردنی كرد، بۆیان هێناو خواردی ووتم: سوننەتە؟ ! فەرمووی: بەڵێ. ئینجا سوار بوو..

عوبەیدی كوڕی جوبەیر ووتی: (رَكِبْتُ مع أبي بصرة الغفاري، في سفينة من الفسطاط، في رمضان، فدفع، ثم قرب غداءه، ثم قال: اقترب فقلت: ألستَ بين البيوت؟ فقال أبو بيَرة: أرغبتَ عن سنة رسول اللّه ﷺ) رواه أحمد، وأبو داود، ورجاله ثقات[٢] واتە: لەگەڵ ئەبو بەسرەی غەففاری سواری كەشتی بوو بووین تا لە شاری فوستاتی میسرەوە سەفەر كەین. رەمەزانیش بوو. دوای سوار بوون، خۆراكی نیوەڕۆی بۆ خواردن ئامادە كرد. ووتی: فەرموو وەرە پێش. ووتم: هەر ئاوا، هێشتا خۆ خانووەكانمان لێوە دیارە. ووتی: بۆچی بە تەمایت واز لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بهێنیت؟ ! شەوكانی دەفەرموێ: ئەم دوو حەدیسە ئەوە روون

---

[١] الترمذي: كتاب الصوم – باب من أكل ثم خرج يريد سفراً، برقم (٧٩٩) (٣ / ١٥٤) وقال المحقق: لم يخرجه أحد من أصحاب الكتب الستة، سوى الترمذي. والبيهقي: كتاب الصيام – باب المسافر يصوم بعض الشهر، ويفطر بعضاً ويصبح صائماً في سفره ثم يفطر (٤ / ٢٤٦)، وقال الألباني: لكن يشهد له الحديث الذي بعده تمام المنة (٤٠٠).

[٢] رواه أبو داود: كتاب الصوم – باب متى يفطر المسافر إذا خرج ؟ برقم (٢٤١٢) (٢ / ٧٩٩)، وأحمد في" المسند" (٦ / ٧) والبيهقي: كتاب الصيام – باب من قال: يفطر وإن خرج بعد طللوع الفجر (٤ /٢٤٦).

دەکەنەوە کە موسافیر دەتوانێت پێش دەرچوونی لە شوێنی سەفەرەکەیەوە (ماڵە یان جێی تره) رۆژووەکەی بشکێنێت.. هەروەها دەڵێت: ئیبنول عەرەبی فەرموویەتی: حەدیسەکەی ئەنەس سەحیحە. بۆیە لەگەڵ خۆئامادە کردندا بۆ سەفەر دەتوانرێت رۆژووەکە بشکێنرێت. ئەمەش هەقە..

ئەو سەفەرەی رێ دەدرێت رۆژووی بۆ بشکێنرێت، هەر ئەو جۆرە سەفەرەیە کە بە هۆیەوە نوێژی بۆ کورت دەکرێتەوە. ئەو ماوەیەش کە موسافیر دەتوانێت تێیدا بەرۆژوو نەبێت، هەر ئەو ماوەیەیە کە دەشێت بەردەوام نوێژی تێدا کورت بکرێتەوە.

**ئەوی نابێ پێ بێت و دوایی دەبێ بیگرێتەوە؟** شەرعناسان لەسەر ئەوە رێکن کە ئافرەتی حەیزدار (کە لە عادەدایە) و زەیستان بۆیان نییە رۆژوو بگرن، یەعنی حەرامە لێیان.. ئەگەر بەرۆژوو بوون، رۆژووەکەیان دروست نابێت.. ئەو رۆژانەی رەمەزان کە بە هۆی حەیزو نیفاسەوە نەیانگرتووە، دەبێت دوای رەمەزان بیگرنەوە.. ئیمامی بوخاری و موسلیم لە دایکە عائیشەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: **(کنا نَحيضُ على عهدِ رسولِ اللّهِ ﷺ فَنُؤْمَرُ بقضاء الصوم، ولا نؤمر بقضاء الصلاة)**[1] واتە: لە زەمانی پێغەمبەردا ﷺ کە دەکەوتینە حەیزەوەفەرمانمان پێ دەدرا کە رۆژووەکە بگرینەوە، بەڵام نوێژەکان نا.

---

[1] البخاري بمعناه: كتاب الحيض – باب لا تقضي الحائض الصلاة (٨٨/١) ومسلم: كتاب الحيض – باب وجوب قضاء الصوم على الحائض، دون الصلاة برقم (٦٩) (٢٦٥/١) وأبو داود: كتاب الطهارة – باب في الحائض لا تقضي الصلاة برقم (٢٦٢ و٢٦٣) (١٨٠/١)، والترمذي: كتاب الطهارة – باب ما جاء في الحائض، أنها لا تقضي الصلاة، برقم (١٣٠) (١ / ٢٣٤) وقال: هذا حديث حسن صحيح، وابن ماجه: كتاب الطهارة وسننها – باب الحائض لا تقضي الصلاة، برقم (٦٣١) (١ / ٢٠٧)، والنسائي: كتاب الحيض والاستحاضة – باب سقوط الصلاة عن الحائض، برقم (٣٨٢) (١ / ١٩١، ١٩٢).

**پوختەی هەمووی:** ئەوانەی رۆژووی رەمەزان لە کاتی خۆیدا ناگرن چەندین پۆلن:

**یەکەم: ئەوانەی نایگرن، دوای رەمەزان دەیگرنەوە، ئەوانیش بریتین لە:**

١- ئەو نەخۆشەی ئومێدی چاك بوونەوەی هەیە.

٢- ئەو کەسەی سەفەری کورتی لە رێدایە.

٣- ئەوی لەبەر خاتری رزگارکردنی نەخۆشێك دەیشکێنێت.

٤- ئەوی دەکەوێتە حەیز (عادەی مانگانەی ژنان) یان نیفاسەوە..

٥- ئافرەتی دووگیان (حامیلە) و شیردەر ئەگەر لە خۆیان یان لە تەندروستی کۆرپەو زارۆکەکانیان ترسان.

**دووەم: ئەوانەی نە گرتنیان لەسەرە نە گێڕانەوەی، بەڵکو کەفارەتی هەموو رۆژەکان دەدەن:**

١ـ ئەو پیرو پەك کەوتانەن کە رۆژوویان بە زەحمەت پێ دەگیرێت.

٢ـ ئەو نەخۆشانەی ئومێدی چاك بوونەوەیان نەماوە.

**سێیەم: ئەوی بۆی نییە نە بیگرێت نە بیگرێتەوە:**

١ـ ئەو کافرەی دوای رەمەزان موسوڵمان دەبێت.

٢ـ منداڵی بچووك، دەشێت بیگرن بەڵام فەرز نییە لەسەریان.

٣ـ شێت، نە دوای چاك بوونەوەی دەیگرێتەوە، نە کەفارەتیشی بۆ دەدرێت.

٤ـ ئەو گەمژەو گەلۆرەی ئەقڵی بە زۆر شت ناشکێت.

## ئەو رۆژانەی نابێت تێیاندا بەڕۆژوو بن

هەندێك رۆژی ساڵ هەن، كە رۆژووگرتن تێیاندا جائیز نیە، چونكە پێغەمبەر ﷺ بەرهەڵستی لە رۆژوو گرتن كردووە تێیاندا[1]، لەوانە:

١- **رۆژانی یەكەمی هەردوو جەژنەكە:** زانایان رایان لەسەر ئەوە كۆیە كە هەموو جۆرێكی بەڕۆژوو بوون لە رۆژی یەكەمی هەردوو جەژنی رەمەزان و قوربان دا حەرامە، چونكە ئیبنو عومەر ـ خوا لێیان رازی بێت ـ دەفەرموێ (**إنَّ رسولَ اللّهِ ﷺ نَهَى عنْ صيامِ هذينِ اليومينِ؛ أمَّا يومُ الفطْرِ، فَفِطْرُكُمْ مِنْ صومِكُمْ، وأمَّا يومُ الأضحَى، فَكُلُوا مِنْ نُسْكِكُمْ**)[2] رواه أحمد، والأربعة) واتە: پێغەمبەر ﷺ بەرهەڵستی لە رۆژوو گرتنی ئەو دوو رۆژە كردووە، چونكە رەمەزانەكە پێبوونو گرتووتانە. ئەمما جەژنی قوربان، بۆ ئەوەیە، تا لە قوربانیەكەی خۆتان بخۆن.. حەدیسی تر زۆرن، وەكو حەدیسەكەی ئەبو سەعیدی خودری ـ خوا لێی رازی بێت ـ كە لە بوخاری و موسلیمدایە (لە پەراوێزی خوارەوەدا ئاماژەی پێكراوە). ئەم دوو رۆژە رۆژی جەژن و

---

[1] البخاري: كتاب الصوم – باب صوم يوم الفطر (٣ / ٥٥) ومسلم: كتاب الصيام – باب النهي عن صوم يوم الفطر ويوم الأضحى برقم (١٤٠ _ ١٤٣) (٧٩٩/٢) والترمذي: كتاب الصوم – باب ما جاء في كراهية الصوم يوم الفطر والنحر برقم(١٣٣/٣) (٧٢٢) وقال: حديث حسن صحيح، والعمل عليه عند أهل العلم وابن ماجه: كتاب الصيام _ باب في النهي عن صيام يوم الفطر والأضحى برقم (١٧٢١) (٥٤٩/١) والموطأ: كتاب الصيام – باب صيام يوم الفطر والأضحى والدهر برقم (٣٦) (١ / ٣٠٠)، وأحمد في" المسند" (٢ / ٥١١).

[2] مسلم: كتاب الصيام – باب النهي عن صوم يوم الفطر ويوم الأضحى برقم (١٣٨) ٢/٧٩٩) والترمذي: كتاب الصوم – باب ما جاء في كراهية الصوم يوم الفطر والنحر برقم (٧٧١) (٣/ ١٣٢ـ١٣٣) وقال: هذا حديث حسن صحيح وابن ماجه: كتاب الصيام – باب في النهي عن صيام يوم الفطر والأضحى، برقم (١٧٢٢) (١ / ٥٤٩) وأحمد في "المسند" (٢٤/١).

شادی موسوڵمانانەو هەموو لایەك خواردنو خواردنەوە پێشکەشی یەکتری دەکەن، بۆیە ناشێت یەکێك لە نێو هەمواندا دەمی خۆی بەستبێتەوە! رۆژوو گرتنی ئەم دوو رۆژە سەرپێچی فەرمانی ئیسلامە..

**٢- رۆژانی تەشریق (دووەم و سێیەم و چوارەم رۆژی جەژنی قوربان)**: واتە رۆژانی یازدەیەم و دوازدەیەم و سیازدەیەمی مانگی ذي الحجة. پێی ووتراوە تەشریق، چونکە لەو سێ رۆژەدا عەرەبەکانی سەردەمی ئیسلام پێستەی قوربانیەکانیان تێدا لەبەر خۆر هەڵدەخست.. ئەبو هورەیرە ـ خوا لێی رازی بێت ـ دەگێڕێتەوە کە (**أَنَّ رسولَ اللّه ﷺ بَعَثَ عبدَ اللّهِ بنَ حُذَافَةَ يَطوفُ في مِنَى: أَلَّا تَصومُوا هذه الأيامَ؛ فإنَّهَا أيامُ أكلٍ وشُرْبٍ وذِكرِ اللّهِ، عز وجل**[1] رواه أحمد بإسناد جيد) واتە: پێغەمبەر ﷺ عبد اللەی کوڕی حوذافەی نارد بۆ مینا کە: لەم رۆژانەدا بەرۆژوو مەبن، ئەمانە رۆژی خواردن و خواردنەوەو یادی خوان.

هەروەها ئیبنو عەبباس ـ خوا لێیان رازی بێت ـ دەفەرموێ: (**أَنَّ رسولَ اللّه ﷺ أَرْسَلَ صائحاً يَصيحُ: أَلَّا تَصومُوا هذه الأيامَ؛ فإنها أيامُ أكلٍ وشُرْبٍ وبِعَالٍ**) رواه الطبراني في الاوسط[2] واتە: پێغەمبەر ﷺ جارچییەکی نارده بازاڕ، تا هاوار کات کە: لەم رۆژانەدا بەرۆژوو مەبن، چونکە ئەمانە رۆژانی خواردن و خواردنەوەو رابواردنی ژن و مێردە.

بەڵام شافیعیەکان دەڵێن: دەشێت کەسێك لەبەر کەفارەت، یان قەرزار بوونی رەمەزان، یان لەبەر نەزرێك (کە لە خۆی گرتووە) لەم رۆژانەدا بەرۆژوو ببێت. ئەمما ئەوی هۆیەکی وای نییە، بۆی نییە بەرۆژوو بێت. رای کەس لەمەدا جیاواز نییە. بۆ غەیری قەرزار باشترە لەم رۆژانەدا بەرۆژوو نەبێت. ٤

---

[1] احمد (٥ / ٧٥، ٧٦، ٢٢٤).

[2] بِعال: سەرجێییە: (جیماع)ە ئەلبانی دەفەرموێ: وهذه الرواية بزيادة "وبعال" ضعيفة، منكرة. انظر: تمام المنة (٤٠٢).

**٣- رۆژووی رۆژی هەینی بە تەنها:** رۆژی هەینی (جومعە) جەژنی هەفتانەی موسوڵمانانە، نابێت شەوانی هەینی تایبەت بکرێت بە قیام اللیلەوە، رۆژووی رۆژەکەشی کارێکی بەرهەڵستی لێ کراوە. جمهور دەفەرموون: ئەوە بەرهەڵستی حەز نەکردن و پەسەند نەکردنە، نەك بەرهەڵستی حەرام بوون (هەر چەندە حەدیسی تریش هەیە کە راشکاوانە باسی حەرام کردنی دەفەرموێ، وەك حەدیسەکەی جوەیرییە لە بوخاریدا)، بەڵام وەکو زانایان فەرموویانە ئەو نەهییە نامێنێت ئەگەر رۆژی پێشتری، یان دواتری بگرێت، یان جومعەکە رۆژی عارفە بوو، یان عاشورا بوو، یان کەوتە ئەو رۆژانەوە کە ئەم راهاتووە بیانگرێت (وەکو ١٤و١٥و١٦ ی مانگە عەرەبیەکان) لەم حاڵەتانەدا ئیشکالی نییەو دەتوانێت بیگرێت. ئیمامی ئەبو حەنیفەو ئیمامی مالیك دەفەرموون: بە تەنهاش بێت قەیدی نییە. بەڵام ئەمە لە دوای هاتنی حەدیس ـ لەگەڵ رێزمان بۆ ئەو دوو ئیمامە بەرێزە ـ جێ سەرنجە، شێخی ئال بەسسام (لە توضیح دا) دەفەرموێ: بە هیچ شێوەیەك رۆژوو گرتنی دوو جەژنەکە جائیز نییە..

عبد اللەی کوڕی عەمر دەگێڕێتەوە کە: (**أنَّ رسولَ اللّه ﷺ دَخَلَ عَلَى جويريةَ بنتِ الحارثِ، وهي صائمةٌ في يومِ جُمُعَةٍ، فقالَ لها: أصمْتِ أمس؟ فقالتْ: لا. قالَ أتُرِيدِينَ أنْ تَصومِي غداً؟ قالتْ: لا. قال: فأفْطِرِي إذَن**[1] رواه أحمد. والنسائي بسند جيد) واتە: پێغەمبەر ﷺ چووە ماڵی جوەیرییەی کچی الحارث، دیتی رۆژی جومعەیەو بەرۆژووە. لێی پرسی: دوێنێ بەرۆژوو بوویت؟ فەرمووی: نەخێر. پێغەمبەر ﷺ پرسیەوە: ئەدی دەتەوێت سبەینێ بەرۆژوو بیت؟ فەرمووی: نەخێر. ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەسا بیشکێنە. عامرالاشعەری

---

[1] البخاري: كتاب الصوم – باب صوم يوم الجمعة (٣ / ٥٤)، وأبو داود: كتاب الصوم – باب الرخصة في ذلك برقم (٢٤٢٢) (٢ / ٨٠٦) وأحمد في "المسند" (١٨٩/٢) (٣٢٤/٦).

دەفەرموێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: (إنَّ يومَ الجُمُعَةِ عيدُكُمْ فَلا تَصومُوهُ، إلا أنْ تَصومُوا قَبْلَهُ أو بَعْدَهُ [1] رواه البزار بسند حسن). واتە: ڕۆژی هەینی جەژنتانە، تێیدا بەڕۆژوو مەبن، مەگەر ڕۆژێك پێشتر یان ڕۆژێك دواتریشی بگرن.

عەلی كوڕی ئەبو طالب ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ دەفەرموێ: (مَنْ كانَ منكمْ مُتَطَوِّعاً، فَلْيُصم يومَ الخميسِ، ولا يَصم يومَ الجمعةِ؛ فإنَّهُ يومُ طعامٍ، وشَرابٍ، وذِكْرٍ) رواه ابن أبي شَيبة بسند حسن) واتە: ئەوی ڕۆژووی سوونەت دەگرێت، با ڕۆژی پێنج شەممە بەڕۆژوو بێتنەك هەینی، چونكە ڕۆژی هەینی ڕۆژی خواردن و خواردنەوەو یادو زیكری خوایە

لە هەردوو سەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە كە جابر ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ گێڕاوێتیەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا تصومُوا يومَ الجمعَةِ، إلا وقَبْلَهُ يومٌ أو بَعْدَهُ يومٌ [2] واتە: ڕۆژانی هەینی بە تەنها مەگرن، یان ڕۆژێكیش پێش ئەو بگرن، یان ڕۆژێك دوای ئەو.. وشەكانی لای ئیمامی موسلیم: (ولا تَخُصوا ليلةَ الجمعةِ بقيامٍ منْ بينِ الليالي، ولا تخصوا يومَ الجمعَةِ بصيامٍ منْ بينِ الأيامِ، إلا أنْ يَكونَ في يَومٍ يصومُهُ أحَدُكُمْ [3] واتە: لە نێو شەواندا شەوانی هەینی تایبەت مەكەن بە شەونوێژ (قيام الليل) ەوە هەروەها لە نێو ڕۆژەكانیشدا ڕۆژی هەینی تایبەت مەكەن بە ڕۆژوو گرتنەوە. مەگەر كەوتبێتە ڕیزی ڕۆژی ڕۆژووی كەسێكتانەوە..

---

[1] كشف الأستار عن زوائد البزار: كتاب الصيام – باب ما جاء في صوم يوم الجمعة، برقم (١٠٦٩) (١ / ٤٩٩)، وقال الهيثمي: رواه البزار، وإسناده حسن. مجمع الزوائد (٣ / ١٩٩).

[2] البخاري: كتاب الصوم – باب صوم يوم الجمعة (٥٤/٣) ومسلم، من حديث أبي هريرة: كتاب الصيام – باب كراهة صيام يوم الجمعة منفرداً، برقم (١٤٧) (٢ / ٨٠١)، ومن حديث جابر، مختصراً: كتاب الصيام / باب كراهة صيام يوم الجمعة منفرداً برقم(١٤٦،١٤٧)٨٠١/٢

[3] مسلم: كتاب الصيام - باب كراهية صيام يوم الجمعة منفرداً، برقم (١٤٨) (٢ / ٨٠١

٤- **رۆژووی رۆژی شەممە بە تەنها:** لە بوسر السەلەمییەوە لە الصمَّائی خوشکیەوە ـ خوا لێیان رازی بێت ـ گێڕراوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا تصوموا يومَ السَّبْتِ، إلا فيمَا افتُرِضَ عَلَيكُمْ و إنْ لَمْ يجِدْ أحدكُم إلا لِحَاءَ عِنَبٍ، أو عُودِ شَجَرَةٍ، فلْيَمْضَغْهُ)[1] رواه أحمد، وأصحاب السنن، والحاكم، وقال: صحيح على شرط مسلم، وحسنه الترمذي) واتە: رۆژی شەممە بە رۆژوو مەبن، مەگەر لەسەرتان فەرز بوو بێت (وەك ئەوەی نەزر بێت یان کەفارەت بێت، یان نەریتێکی رۆژوو گرتنی رۆژووەوانەکە بێت) ئەوسا ئەگەر یەکێکتان هیچی غەیری توێکڵە دارێك، یان پێستە ترێیەك (مەبەست لە شتێکی وەکو لۆتەیە: بۆڵە ترێیەکی وشك هەڵاتوو، کە نەشبووبێت بە مێوژ) دەست نەکەوێت، با هەر بیگرێت.

ئیمامی ترمزی دەفەرموێ: حەز نەکردن لە رۆژووی شەممان لەبەر ئەوەدیە، کە رۆژێکی پیرۆزی جولەکەیە. ئوم سەلەمە ـ خوا لێی رازی بێت ـ دەفەرموێ (كانَ النبيُّ ﷺ يصومُ يومَ السبتِ، ويومَ الأحدِ، أكثرَ ممَّا يصومُ مِنَ الأيَّامِ، ويقولُ: إنَّهمَا عيدُ المشركينَ، فأنا أحِبُّ أنْ أخَالِفَهُمْ)[2] رواه أحمد، والبيهقي، والحاكم، وابن خزيمة

---

[1] أبو داود: كتاب الصوم – باب النهي أن يخص يوم السبت بصوم، برقم (٢٤٢١) (٢ / ٨٠٥)، والترمذي: كتاب الصوم – باب صوم السبت، برقم (٧٤٤) (٣ / ١١١) وقال: حديث حسن. وابن ماجه: كتاب الصوم – باب في صيام يوم السبت، برقم (١٧٢٦) (١ / ٥٥٠)، والحاكم: كتاب الصوم – باب النهي عن صوم يوم السبت(١/٤٣٥)) وقال: هذا حديث صحيح على شرط البخاري، ولم يخرجاه. وسكت عليه الذهبي، والدارمي: كتاب الصوم _ باب في صيام يوم السبت (٢ / ١٩) وفي "الزوائد": رواه ابن حبان في "صحيحه"، وأحمد في "المسند" (٤ / ١٨٩) (٦ / ٣٦٨، ٣٦٩).

[2] الحاكم: كتاب الصوم – باب ترغيب صيام يوم السبت والأحد (١ / ٤٣٦) وصححه الحاكم، ووافقه الذهبي والبيهقي: كتاب الصيام – باب ما ورد من النهي عن تخصيص يوم السبت بالصوم (٤ / ٣٠٣ (وأحمد في "المسند" (٦ / ٣٢٤) وصحيح ابن خزيمة: كتاب الصيام – باب الرخصة في يوم السبت إذا صام يوم الأحد بعده، برقم (٢١٦٧) (٣ / ٣١٨ ).

وصحاه ) واته: پێغەمبەر ﷺ زۆرترین رۆژ کە بەرۆژوو دەبوو شەممەو یەك شەممان بوو، چونکە دەیفەرموو: ئەم دوو رۆژە جەژنی موشریکەکانە، بۆیە حەز دەکەم پێچەوانەیان بیمەوە تێیاندا.

لەبەر ئەم حەدیسانەیە کە مەزهەبی حەنەفی و شافیعی و حەنبەلی رۆژوو گرتنی رۆژانی شەممانیان ـ بە تەنها شەممان ـ پێ چاك نییەو کەراهەتی هەیە لایان. ئەمما مەزهەبی مالیکی پێیان ئاساییە و زانای تریش هەن کە رای ئەمانیش بەهێز دەکەن.

٥- **رۆژی گومان لێکراو**: ئەو رۆژەیە کە دەکەوێتە پێش رەمەزان و نازانرێت یەکەمی رەمەزانە یان کۆتایی شەعبانە. ئەمەش نابێت موسولمان بیگرێت. چ رۆژێك یان دوو رۆژی پێش رەمەزان، کە پێی دەوترێت: رۆژی گومان لێکراو: چونکە پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لەوەی کەسێك رۆژێك یان دوو رۆژی پێش رەمەزان بەرۆژوو بێت، مەگەر عوزرێکی هەبێت، وەك دەفەرموێ: (**لا تُقَدِّمُوا رَمَضَانَ بِصومِ يَومٍ ولا يَومَينِ إلا رَجُلٌ كانَ يَصومُ يَوماً فَلْيَصمْهُ**) متفق عليه[1]. واتە: رۆژێك یان دوو رۆژ پێش رەمەزان مەگرن، مەگەر کەسێك کە راهاتبێت بۆ نموونە رۆژانی دووشەممان بەرۆژوو بوو بێت و قەدەر وا بوو کە رۆژی پێش رەمەزان دوو شەممە بوو، ئەم مۆلەتەش کۆڕای زانایانی لەسەرە، تەنانەت شافیعییەکان دەفەرموون نابێت لە پازدەی مانگی شەعبانەوە بەرۆژوو بێت، ئەمەش بۆ ئەوەیە کە فەرزەکەی رەمەزان لە سوننەت و عادەت جیا کرێتەوەو موسولمانان وەك بۆنەیەکی ئومەتەکەیان خۆیان بۆ پێشوازی کردنی ئامادە کەن..

عەمماری کوری یاسر ـ خوا لێیان رازی بێت ـ دەفەرموێ: (**مَنْ صامَ اليومَ الذي يَشُكُّ فيهِ، فَقَدْ عَصى أبَا القاسِمِ** ﷺ)[2] رواه أصحاب السنن وقال الترمذي: حديث

---

[1] البخاري: كتاب الصوم / ژمارە ١٧٨١ ومسلم / كتاب الصيام ژمارە ١٨١٢.

[2] البخاري (تعليقا): كتاب الصوم – باب قول النبي صلى الله عليه وسلم: إذا رأيتم الهلال فصوموا... (٣ / ٣٤) والترمذي: كتاب الصوم – باب كراهية صوم يوم الشك برقم (٦٨٦) (٣ / ٦١) وقال: حديث حسن صحيح. وأبو داود: كتاب الصوم – باب كراهية صوم يوم الشك برقم (٢٣٣٤) (٢ /=

حسنٌ صحيحٌ) واته: هەر کەس لەو ڕۆژەدا بـە ڕۆژوو بێـت، کـە خـۆی گومـانی لێـی هەیە؛ ئەوە سەرپێچی فەرمانی ئەبو القاسمی کـردووە (واتـە: هـی پێغەمبـەر ﷺ چونکە قاسم کوڕە گەورەی پێغەمبەر بوو ﷺ). ئیمامی ترمزی دەفەرموێ: ئەمـە رای زۆرینەی ئەهلی عیلم (شەرعناسان)ە. وەکو سوفیانی ثەوری ومالیکی کـوڕی ئەنەس و عبداللەی کوڕی موبارەك و شافیعی و ئەحمەدو ئیسحاق. هەموویان هەر پێیان ناخۆش بوو، کە کەسێك لە ڕۆژی گومان لێکراودا بەڕۆژوو بێـت. زۆریـشیان وا دەبینن، کە ئەگەر کەسێك لەو ڕۆژەدا بەڕۆژوو بوو، دوایی زانـی، کـە ڕەمـەزان بووە، دەبێت دوای ڕەمەزان بیگرێتەوە. (چونکە ئەو ڕۆژووەی بە خواردوو بۆ حـسێب کراوە، نەك بە ڕۆژوو، بەڵام ئەگەر بەڕۆژوو بوو چونکە دەکەوتە ڕۆژی نـەزرو کـەفارەت و نەریتی ڕۆژوو گرتنیەوە) ئەوە قەیدی نییە ئـەبو هـورەیرە ـ خـوا لێـی ڕازی بێـت ـ گێڕایەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (**لا تقدَّموا صومَ رمضانَ بيومٍ ولا يـومَين، إلا أنْ يكونَ صومٌ يَصومُهُ رجلٌ، فَلْيَصم ذلكَ اليومَ**)[١] رواه الجماعة وقال الترمذي: حسن صحيح)

واته: ڕەمەزان پێش مەخەن، ڕۆژێك دوو ڕۆژی بهێننـە پـێش! (واتـە بـە بـەڕۆژوو بوونی ڕۆژی گومان لێکراو) مەگەر کەوتبێتە ئەو ڕۆژانەوە، کە کەسێك خووی بـە

---

=٧٤٩، ٧٥٠) وابن ماجه: كتاب الصيام – باب ما جاء في صيام يوم الشك برقم (١٦٤٥) (١ / ٥٢٧) والدارمي: كتاب الصوم – باب في النهي عن صيام يوم الشك (٢ / ٢) والنسائي: كتاب الصوم – باب صيام يوم الشك، برقم (٢١٨٨.((١٥٣/٤) وصحيح ابن خزيمة وابن حبان.

[١] البخاري: كتاب الصوم – باب لا يتقدمن رمضان بصوم يوم أو يومين (٣ / ٣٥، ٣٦ (ومسلم: كتاب الصيام – باب لا تقدموا رمضان بصوم يوم ولا يومين برقم (٢١) (٧٦٢/٢) والترمذي: كتاب الصوم – باب ما جاء في كراهية الصوم في النصف الثاني من شعبان لحال رمضان برقم (٧٣٨) (٣ / ١٠٦) وباب ما جاء لا تقَدمُوا الشهر بصوم، برقم (٦٨٥) (٦٠/٣) وقال: حديث حسن صحيح، وأبو داود: كتاب الصوم _ باب فيمن يصلُ شعبان برمضان، برقم (٢٣٣٥) (٢ / ٧٥٠) وابن ماجه: كتاب الصيام – باب ما جاء في النهي أن يتقدم رمضان بصوم، إلا من صام صوماً، فوافقه، برقم (١٦٥٠) (١ / ٥٢٨) والنسائي: كتاب الصيام – باب التقدم قبل شهر رمضان برقم (٢١٧٢) (٤ / ١٤٩)، وأحمد في "المسند (٣٤٧/٢،٢٣٤) ٤٠٨، ٤٧٧، ٤٩٧، ٥١٣، ٥٢١، والدارمي: كتاب الصوم – باب النهي عن التقدم في الصيام قبل الرؤية (٢ / ٤).

گرتنیانەوە گرتووە، گەر وا بوو با بەرۆژوو بێت. ئیمامی ترمزی دەفەرموێ: ئەهلی عیلم (زانا شەرعناسەکان) کار بەمە دەکەن. پێیان ناخۆش بوو کەسێك بەرۆژوو گرتنی رۆژێك یان دوو رۆژ پێشتر لە رەمەزان، پەلە لە پێش خستنی رەمەزانەکە بکات. ئەوی بۆی هەبوو بەرۆژوو بێت، هەر ئەوانە بوون، کە نەزر یان کەفارەتیان لەسەر بوو، یان ئەوانەی، کە خوویان بە رۆژووەوە گرتووەو قەدەرەن رۆژوودکەیان کەوتۆتە ئەو رۆژەوە، لەوانەیە لەو رۆژەدا لەبەر هەورو چەرە دوکەڵ و شتی وا هەیڤ نەبینرێت، بەو هۆیەشەوەیە، کە نازانرێت ئەو رۆژە عایدی شەعبانەو تەواو کەرەکەیەتی یان بووە بە رەمەزان بەڵام هەیڤەکەیان نەدیووە.. پێغەمبەریش ـ وەکو ئیمامی ئیبنول القەییم لە زاد المعاددا دەفەرموێ ـ: دڵنیا نەبووبێت لە بینینی هەیڤی رەمەزان بەرۆژوو نەبووە. جا ئایا خۆی بیبینیایە، یان یەکێك شایەتی بۆ بدایە وەك شایەتیەکەی ئیبنو عومەر، گەر ئەو رۆژی گومانە هەور بوایە سی رۆژەی شەعبانی تەواو دەکرد ئینجا پیێ دەبوو..

٦- **رۆژووی دوازدە مانگە:** ئەمەش لەو رۆژووانەیە کە نەهی لیێ کراوە. کە نابێت کەسێك هەموو رۆژانی ساڵ بەرۆژوو بێت. چونکە ئەو رۆژانەشی تیێ دەکەوێت کە شەرع رێی نەداوە رۆژوویان تێدا بگیرێت. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (لا صامَ، مَنْ صامَ الأبد. رواه أحمد، والبخاري، ومسلم)[1] واتە: ئەوی هەمیشە بەرۆژوو دەبێت، رۆژووی نەگرتووە.

ئەگەر کەسێك رۆژی یەکەمی شەووال (یەکەم رۆژی جەژنی رەمەزان) و چوار رۆژەی جەژنی قوربانی خوارد، توانای هەبوو، باقی رۆژانی ساڵ بەرۆژوو بوو، بۆی

---

[1] البخاري: كتاب الصوم – باب حق الأهل في الصوم (٣ / ٥٢) ومسلم: كتاب الصيام – باب النهي عن صوم الدهر لمن تضرر به، أو فوت به حقاً...، برقم (١٨٦، ١٨٧) (٢ / ٨١٤، ٨١٥)، والنسائي: كتاب الصيام – باب ذكر الاختلاف على عطاء في الخبر فيه، برقم (٢٣٧٨) (٤ / ٢٠٦)، وابن ماجه: كتاب الصيام _ باب ما جاء في صيام الأبد، برقم (١٧٠٦) (١ / ٥٤٤)، وأحمد في "المسند" (٢ / ١٩٩،١٩٠،١٨٩،١٦٤،٢١٢) (٦/٤٥٥).

جائیزەو ئەم نەهییــە نایگرێتــەوە. ئیمــامی ترمــزی دەفــەرموێ زۆربــەی زانایــان فەرموویانە: موسوڵمان بۆی هەیە، ساڵەکە هــەمووی ـ جگــە لــە رۆژی یەکــەمی جەژنی رەمەزان و چوار رۆژەکەی قوربــان ـ بــەرۆژوو بێــت چــونکە لــە کەراهــەتی رۆژووی ساڵ هاتۆتە دەرەوەو نەهییەکە نایگرێتەوە. ئیمامی مالیــك و شــافیعی و ئەحمەدو ئیسحاق فەتوایان لەسەر ئەمە هەیە. پێغەمبــەر ﷺ بــە حمــزە الاســلمی فەرموو: (صمْ إنْ شِئْتَ، وأفْطِرْ إنْ شِئْتَ) [1] واتە: گەر وویستت بەرۆژوو بە، گەر وویستیشت بەرۆژوو مەبە.

باشترین شێوازی رۆژوو گرتن ئەوەیە رۆژێك بگریــت و رۆژێــك بخۆیــت. دواتــر باسی ئەمە دەکەین.

**٧- رۆژووی ئافرەت بێ رازی بوونی مێردەکەی:** پێغەمبــەر ﷺ نەهی کردووە لە ئافرەت کە بە بێ مۆڵەت و رەزامەندی مێردەکەی ـ کە لــە لایەتی ـ بەرۆژوو ببێت. ئەبو هورەیرە ـ خوا لێی رازی بێــت ـ گێراوێتیــەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (**لا تصمْ المرأةُ يوماً واحِداً، وزوجُها شاهِدٌ إلا بِإذنه، إلا رمضان**) [2] رواه أحمد، والبخاري، ومسلم واتە: ئافرەت کە مێردەکەی

---

[1] مسلم: كتاب الصوم، باب التخيير في الصوم والفطر في السفر(ح ١٠٤، ١٠٥) والنسائي: كتاب الصيام – باب ذكر الاختلاف على هشام بن عروة فيه برقم (٢٣٠١، ٢٣٠٧) (٤ / ١٨٦، ١٨٧)، وباب سرد الصيام برقم (٢٣٨٤) (٤ / ٢٠٧) وابن ماجه: كتاب الصيام – باب ما جاء في الصوم في السَّفر، برقم (١٦٦٢) (١ / ٥٣١)، والموطأ: كتاب الصيام – باب ما جاء في الصيام في السفر، برقم (٢٤) (١ / ٢٩٥).

[2] البخاري: كتاب النكاح – باب صوم المرأة بإذن زوجها تطوعاً (٣٩/٧) ومسلم: كتاب الزكاة – باب ما أنفق العبد من مال مولاه، برقم (٨٤) (٢ / ٧١١) الترمذي: كتاب الصوم – باب كراهية صوم المرأة إلا بإذن زوجها برقم (٧٨٢)، وقال: حديث حسن صحيح (٣ / ١٤٢) وأبو داود: كتاب الصوم – باب المرأة تصوم بغير إذن زوجها برقم (٢٤٥٨) (٢ / ٨٢٦ ٨٢٧) وابن ماجه: كتاب الصيام – باب في المرأة تصوم بغير إذن زوجها برقم (١٧٦١) (١ / ٥٦٠) والدارمي: كتاب الصوم – باب النهي عن صوم المرأة تطوعاً، إلا بإذن زوجها (٢ / ١٢) وأحمد في "المسند(٢ / ٣١٦، ٤٤٤، ٤٧٦، ٥٠٠).

لە لای بوو، لە غەیری رەمەزاندا، نابێت بەرۆژوو بێت مەگەر بە ئیزن و رەزای مێردەکەی.

زانایانی شەرع ئەم نەهییەیان بە حەرام کردن لێك داوەتەوەو کاریان پێ کردووە. چونکە بە دەست درێژی کردنە سەر مافی پیاوەکەیان حسێب کردووە. بۆیە فەرموویانە: ئەگەر بێ ئیزنی مێردەکەی بەرۆژوو بێت، مێردەکەی بۆی هەیە پێی بشکێنێت. بێ گومان ئەمە لە غەیری رۆژووی رەمەزانە. چونکە رۆژووی رەمەزان فەرزە لەسەری و مێردەکەی بۆی نییە رێی گرتنی لێ بگرێت، لەمەوە دەزانیت، کە ئەو ئافرەتانەی شوویان بە پیاوی بێ دین کردووە چەند داماون، کە ناهێڵن بەرۆژوو بن، بێ گومان ژنە نەك هەر بۆی هەیە گوێ بە بەرهەڵستی و قەدەغەکردنی مێردەکەی نەدات، بەڵکو واجبیشە لەسەری..

ئەم رۆژووەی ئەم، پەیوەندی بە باری عاتیفی کابراوە هەیە بۆیە ئافرەتەکە بۆی هەیە بێ ئیزن و رەزای مێردەکەی بەرۆژوو بێت، ئەگەر مێردەکەی لەوێ نەبوویان لەوێ بوو، بەڵام نەخۆش بوو، نەخۆشیەکی وا، کە نەتوانێت سەرجێیی (جیماع)ی لەگەڵدا بکات. مافی مێردەکەیە وەکو ئیمامی ئیبنو تەیمییە دەفەرموێ ـ پێش مافی باوکیشیەتی.

رەزامەندی وەرگرتنەکەش مانای وا نییە هەموو شەوێك ژنە عەریزەیەك تەقدیمی مێردەکەی کات و داوای رەزامەندی رۆژوو گرتنی سبەینێی بکات!! نا، بەڵکو دەشێت هەر بە نیشانەو بەڵگەیەکی عورف و عادەتی خۆیان ئەو رەزامەندییە روون بکەنەوە..

٨ـ **رۆژووی بەردەوام**: واتە پێکەوە گرێدانی رۆژەکانی رۆژوو بێ ئەوەی بەربانگ و پارشێوی رۆژانەیان بخاتە نێوان. ئەمەش نابێت. چونکە ئەبو هورەیرە ـ خوا لێی رازی بێت ـ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إيَّاكم والوِصالَ. قالَها ثلاثَ مرَّاتٍ، قالوا: فإنَّكَ تُواصلُ يا رسولَ اللّهِ؟ قالَ:

إنَّكُمْ لَسْتُمْ في ذلكَ مثلي إنِّي أبيتُ يُطْعِمُني رَبِّي ويَسقِيني، فاكْلَفُوا من الأعمَالِ ما تُطيقُونَ)[١] رواه البخاري، ومسلم) واته: سێ جار فەرمووی: نەکەن رۆژوو بەردەوام کەن. ووتیان: ئەدی ئەی پێغەمبەری خوا جەنابت وا ناکەیت؟ ! فەرمووی: بەڵام ئێوە لەوددا وەکو من نین. من شەوو رۆژ دەبەمە سەر، خوا خواردن و خواردنەوەم دەداتێ (واتە: خوای گەورە هێزی کەسێکم پێ دەبەخشێت کە نان و ئاوی خوارد بێت) ئەوەندە کار بخەنە سەر شانی خۆتان کە دەتوانن.

شەرعناسان ئەم بەرهەڵستییەیان بە کەراهەت (پێناخۆش بوون) لێك داوەتەوە. بۆیە ئیمام ئەحمەد وئیسحاق و ابن المنذر رێیان داوە رۆژووەوان گەر توانای هەبێ، گەر بەربانگیشی نەکردەوە، دەبێت پارشێو شت بخوات. ئەبو سەعیدی خودری -خوا لێی رازی بێت- دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لا تواصلُوا، فأيّكُمْ أرادَ أنْ يواصلَ فَلْيُواصلْ حتى السَحَرِ)[٢] رواه البخاري) واتە: رۆژوو بەردەوام مەکەن (دوو رۆژی رۆژوو پێکەوە گرێ مەدەن) هەر کەسێکتان ویستی بەردەوام بێت، با تا پارشێو بێت. لەوانەی رایان وایە، کە ئەم رۆژووە بەردەوامە حەرام نییەو جائیزە: عبداللەی کوڕی الزوبەیرو هەندێك لە سەلەفی وەکو ئیبنو ئەبی لەیلاو ئیبراهیمی النەخەعی و ئەبول جەوزاو، ئیمام ئەحمەد ـ بە لایەوە مەکروهیشە ـ بەڵام دەفەرموێ: تا پارشێو جائیزە، چونکە حەدیسی بوخاری هەیە، کە پێغەمبەر ﷺ بەرهەڵستی لە گرێدانی چەند رۆژ پێکەوە کردووە (لا تُواصلُوا فأيُّكُمْ أرادَ أنْ يُواصلَ فليواصلَ حتَّى السَّحَرِ)..

---

[١] البخاري: كتاب الصوم _ باب التنكيل لمن أكثر الوصال (٣ / ٤٩) ومسلم: كتاب الصيام _ باب النهي عن الوصال في الصوم رقم (٥٨) (٢ / ٧٧٤) والموطأ: كتاب الصيام _ باب النهي عن الوصال في الصيام برقم (٣٩) (١ / ٣٠١) والدارمي: كتاب الصوم _ باب النهي عن الوصال في الصوم (٢ / ٧، ٨) وأحمد في المسند (٢ / ٢٣١، ٢٣٧، ٢٤٤، ٣١٥، ٣٤٥، ٤١٨).

[٢] البخاري: كتاب الصوم – باب الوصال ومن قال: ليس في الليل صيام... (٣ / ٤٨) ابو داود: كتاب الصوم _ باب في الوصال، برقم (٢٣٦١) (٢ / ٧٦٧)، والدارمي: كتاب الصوم – باب صيام الستة من شوال (٢ / ٢١) وأحمد في "المسند" (٣/٨).

# رۆژووی سوننەت

رۆژووی سوننەت یەعنی ئەوانەی کە فەرز نین و موسوڵمان دەتوانێت نەیانگرێت بەڵام لە گرتنیاندا خێری خواپەرستیەکەو خێری زیندوو راگرتنی سوننەتەکەشی دەست دەکەوێت، هەموو خواپەرستیەکان هەر وان بەڵام رۆژوو - وەکو ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێ - رۆژوو باشترین سوننەت بەجێهێنانە چونکە ریای تێ ناکەوێت.. بۆیە پێغەمبەر ﷺ موسوڵمانانی هان دەدا لەم رۆژانەی خوارەوەدا بەرۆژوو بن:

١- **شەشەڵان (شەش رۆژی شەووال):** ئەم شەش رۆژە زۆر گەورەیەو رۆژووەکەشی لەلای هەر چوار ئیمامەکە، جگە لە ئیمامی مالیك موستەحەببە، حەدیسی زۆری لەسەرە لەوانەی، کە هەموو رێگاکانی گێرانەوەیان تێدا هاتۆتە دی و زیاتر لە بیست کەس ریوایەتی کردووە وەك ئەم حەدیسەی، کە ئەبو ئەیوبی ئەنساری - خوا لێی رازی بێت - گێراویتیەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (**مَنْ صامَ رمضانَ، ثُمَّ أَتْبَعَهُ سِتّاً مِنْ شَوَّال، فَكَأَنمَّا صامَ الدَّهْرَ**)[1] رواه الجماعة الا البخاري والنسائي. واتە: هەر کەس ردمەزانەکەو شەش رۆژی مانگی شەووال بەرۆژوو بێت، وەك ئەوە وایە ساڵەکە هەمووی بەرۆژوو بوو بێت[2].

---

[1] مسلم: كتاب الصوم – باب استحباب صوم ستة أيام من شوال اتباعاً لرمضان، برقم (٢٠٤) (٢/٨٢٢)، وأبو داود: كتاب الصوم – باب في صوم ستة أيام من شوال، برقم (٢٤٣٣) (٢/٨١٢،٨١٣) والترمذي: كتاب الصوم – باب ما جاء في صيام ستة أيام من شوال، برقم (٧٥٩) (٣ / ١٢٣)، وقال: حديث حسن صحيح وابن ماجه: كتاب الصيام – باب صيام ستة أيام من شوال، برقم (١٧١٦) (١ / ٥٤٧).

[2] چونکە هەر چاکەیەك بە دەیە، ٣٠ سی رۆژەی رەمەزان دەکاتە ٣٠٠ سێ سەد + شەشی شەووالیش دەکاتە شەست، ئەمە ٣٦٠ بەقەدەر رۆژانی ساڵەکە.

ئیمام ئەحمەد دەفەرموێ: شەش رۆژەکە یەك لە دوای یەك بن یان لێك جودا، ئیشکالی نییە. هەردوو شێوەکە وەکو یەکن.. بەلاّم حەنەفی و شافیعییەکان دەفەرموون: باشتر وایە هەر لە دوای یەکەم رۆژی جەژن و یەك لە دوای یەك بن.

**مەسەلەیەکی گرنگ:** زۆر لە مەلای کوردەواری فەتوایان لەسەر ئەوەیە کە هەر کەس قەرزاری رەمەزان بوو، شەش رۆژەکەی شەووالی گرتەوە هەم بە قەرز دانەوەکە بۆی حسێبە هەم بە سوننەتی شەشەلاّنەکە، بەلاّم وا پێناچێت بۆچوونێکی بەهێز بێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی هەرکەس رەمەزانەکە بەرۆژوو بوو.. ئینجا شەشەلاّنەکە بگرێت، نەك رۆژووە فەرزەکە بە نوقسانی بهێڵێتەوەو بچێتە سەر سوونەت، بۆیە **والله اعلم** راستتر ئەوەیە بابای قەرزار بکەوێتە گرتنەوەی قەرزەکانی ئینجا کە تەواو بوون با شەش رۆژ لە شەووال ـ ئەگەر مایەوە ـ بگرێت، ئەگەر نەشمایەوە، با سوونەتی تر بگرێت، خۆ شەشەلاّنیش لە مانگی تردا ناگیرێتەوە..

٢- **نۆمینەی حاجیان:** ئەمە بە کوردی نۆمینەیە، دەنا خۆی دە رۆژی مانگی **ذي الحجة**یە، ئەو رۆژانەیە کە حاجیەکان لە مەراسیمی حەجدان، مەرجیشە رۆژی عارفەی تێدا بێت (بۆ غەیری ئەو کەسەی لە حەجە) بۆیە ووتراویشە نۆمینە چونکە بە عارفەوە دەبێت بە دە..

ـ قەتادە دەگێرێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (**صومُ يَومِ عَرَفَةَ يُكَفِّر سَنَتَينِ؛ ماضيةً ومُستقبَلَةً، وصومُ يومِ عاشوراءَ يُكَفِّرُ سنةً ماضيةً**)[1] رواه الجماعة، إلا البخاري، والترمذي) واتە: رۆژوو گرتنی عارفە گوناهی دوو ساڵ دەسڕێتەوە، ساڵێ پێشترو ساڵێك دواتر. رۆژوو گرتنی عاشوراش هی ساڵی رابوردوو.

---

[1] ابن ماجه بمعناه: كتاب الصيام – صيام يوم عرفة برقم (١٧٣٠، ١٧٣١) ١ /٥٥١ وأحمد في المسند (٥ / ٢٩٦، ٢٩).

ـ حەفسە خان ـ خوا لێی رازی بێت ـ فەرمووی: (أربعٌ لَمْ يَكُنْ يَدَعَهُنَّ رسولُ اللّه ﷺ؛ صيامُ عاشوراء والعَشْرَ وثلاثةَ أيامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، والركعتينِ قبلَ الغَدَاةِ)[1] رواه أحمد، والنسائي) واتە: چوار جۆرە پەرستن هەیە، کە پێغەمبەر ﷺ پێیانەوە پابەند دەبوو، دەیگرتن: رۆژووی عاشورا، نۆمینەی حاجیان (دە رۆژی ذي الحجة) سێ رۆژ لە هەموو مانگێك، دوو ركات سوننەتی پێش نیوەڕۆ.

ـ ئەبو هورەیرە ـ خوا لێی رازی بێت ـ فەرمووی: (نَهى رسولُ اللّه ﷺ عنْ صومِ يومِ عرفةَ بِعَرَفَاتٍ)[2]. رواه أحمد، وأبو داود، والنسائي، وابن ماجه) واتە پێغەمبەر ﷺ نەیدەهێشت ئەو حاجیانەی لە رۆژی عارفەدا، لەسەر کێوی عەرەفاتن بەرۆژوو بن. ئیمامی ترمذی دەفەرموێ: ئەهلی عیلم پێیان چاك بوو خەڵك لە عارفەدا بەرۆژوو بن جگە لەو حاجیانەی، کە لە کاتی حەجدا لەسەر کێوی عەرەفات کۆدەبنەوە.

ـ ئوموول فەضل ـ خوا لێی رازی بێت ـ دەفەرموێ: (أنهم شَكُّوا في صومِ رسولِ اللّهِ ﷺ يومِ عرفةِ، فأرسلتُ إليهِ بلَبَنٍ فشَرِبَ، وهو يَخْطُبُ النَّاسَ بِعَرَفَةَ)[3] متفق

---

[1] النسائي: كتاب الصيام – باب كيف يصوم ثلاثة أيام من كل شهر وذكر اختلاف الناقلين للخبر في ذلك برقم (٢٤١٦) (٤/٢٢٠) واحمد في المسند (٦/٢٨٧).

[2] أبو داود: كتاب الصوم – باب في صوم يوم عرفة بعرفة برقم (٢٤٤٠) (٢ / ٨١٦ (والنسائي: كتاب الحج – باب النهي عن صوم يوم عرفة (ح ٣٠٠٤) (٥ / ٢٧٨) وابن ماجه: كتاب الصوم – باب صيام يوم عرفة برقم (١٧٣٢) (١ / ٥٥١) وأحمد في المسند(٢/٣٠٤، ٤٤٦) وهو ضعيف انظر الضعيفة (٤٠٤) وأحمد في "المسند" (٦ / ٢٨٧.(٧/ ٣٠٤).

[3] البخاري: كتاب الصوم – باب صوم يوم عرفة (٣ / ٥٥)، ومسلم: كتاب الصيام – باب استحباب الفطر للحاج يوم عرفة، برقم (١١٠، ١١١) (٢ / ٧٩١)، والترمذي، من حديث ابن عباس: كتاب الصوم – باب صوم يوم عرفة بعرفة، برقم (٧٥٠) وقال: حديث ابن عباس حديث حسن صحيح (٣ / ١١٥)، وأحمد في "المسند" (١ / ٢١٧، ٢٧٨، ٢٧٩، ٣٤٤، ٣٥٩، ٣٦٠، ٦ /٣٤٠،٣٣٨ وأبو داود: كتاب الصوم – باب في صوم يوم عرفة بعرفة، برقم (٢٤٤١) (٢/٨١٧).

علیه ) کۆمەڵێك گومانیان لەوە هەبوو رۆژی عارفەیەو کە پێغەمبەر ﷺ لەسەر کێوی عەرەفاتەو بەرۆژوو بێت، بۆیە منیش هەندێك شیرم بۆ نارد، ئەویش لەو کاتەی ووتاری دەدا دایانیّ، خواردیەوە.

٣- **رۆژووی موحەڕڕەم:** مانگی موحەڕڕەم یەکەمین مانگی عەرەبییە، جەختی زۆر لەسەر بەرۆژوو بوونی رۆژانی عاشورا(رۆژی دەیەمی مانگی موحەڕەم)هەیە، هەروەها رۆژێك پێشتری لەگەڵیدا چاکترە.

ـ ئەبو هورەیرە ـ خوا لێی رازی بێت ـ دەفەرموێ: (**سُئِلَ رسولُ اللّه ﷺ، أيُّ الصلاة أفضَلُ بعدَ المَكْتُوبَة؟ قال: الصلاةُ في جَوف الليل. قيلَ: ثُمَّ أيُّ الصيامِ أفضلُ بعدَ رمضانَ؟ قالَ: شهرُ اللّهِ الذي تَدْعُونَهُ المحرَّمَ** )[١] رواه أحمد، ومسلم، وأبو داود ) واتە لە پێغەمبەریان ﷺ پرسی: چ نوێژێك دوای نوێژە فەرزەکان خێری زۆرترە؟ فەرمووی: نوێژی نیوە شەوان. ووتیان: ئەدی جگە لە رەمەزان رۆژووی چ رۆژێك چاکترە؟ فەرمووی: ئەو مانگەی خوا، کە پێی دەڵێن موحەڕڕەم.

**هەندێك لە زانایان وای بۆ چوون، کە رۆژێك پێش دەی موحەڕڕەم و رۆژێکیش پاش ئەو پێکەوە بگیرێن سوننەتە، بەڵام ئەمە نەسەلمێنراوە، کە سوننەتە**، ئەو حەدیسەی هەندێك لە زانایان ئیعتیمادیان کردۆتە سەر، کە فەرموویێتی: (**صوموا قَبْلَهُ يوماً وبعدَهُ يوماً** ) زانایان فەرمویانە: زۆر زەعیفە.

ـ موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ـ خوا لێیان رازی بێت ـ دەفەرموێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: (**إنَّ هذا يومُ عاشوراء، ولَمْ يُكتَبْ عليكمْ صيامُه،**

---

[١] مسلم: كتاب الصيام – باب فضل صوم المحرم، برقم (٢٠٢، ٢٠٣) (٢ / ٨٢١) وأبو داود: كتاب الصوم – باب في صوم المحرم، برقم (٢٤٢٩) (٢ / ٨١١) والترمذي مختصراً: كتاب الصوم – باب ما جاء في صوم المحرم برقم (٧٤٠ ٣ / ١٠٨) وقال: حديث حسن. وابن ماجه مختصراً: كتاب الصيام – باب صيام أشهر الحرم برقم (١٧٤٢) (١ / ٥٥٤) والدارمي: كتاب الصيام – باب في صيام المحرم (٢ / ٢١) وأحمد (٢ / ٣٠٣،٣٤٢، ٥٣٥،٣٤٤).

وأنا صائم، فَمَنْ شاءَ صامَ، ومنْ شاءَ فَليُفْطِرْ )[١]متفق عليه ) ئـەمڕۆ عاشـورايه، رۆژوويتان لەسەر فەرز نييه، بەلاّم من بەرۆژووم، ئێوەش هەر كەس حەز دەكـات با بەرۆژوو بێت، ئەوی حەزيش ناكات، با پێ نەبێت.

ـ خاتوو عائيشه ـ خوا لێی رازی بێـت ـ فـەرمووی: (كـان يـوم عاشـوراء يومـاً تصومه قريش في الجاهلية، وكان رسول الله ﷺ يصومه، فلما قـدمَ المدينـة صامه، وأمر الناس بصيامه، فلما فُرِض رمضان، قال: من شاء صامه، ومن شاء تركه )[٢]متفق عليـه، واتـه: قورەيش له زەمانی جاهيلييەتدا، له رۆژی عاشورادا بەرۆژوو دەبوون، بۆيه پێغەمبەريش ﷺ بەرۆژوو دەبوو. كه كۆچيـشی كـرد بـۆ مەدينه هەر دەيگرت. فەرمانی به خەلّكيش كرد، كه بيگرن. بـەلاّم كـه دوايـی رۆژووی رەمەزان فەرز كرا فەرمووی: كێ پێی خۆشه، بـا هـەر بيگرێـت، كـێش حەز دەكات، با نەيگرێت..

ـ ئيبنو عەبباس ـ خوا لێيان رازی بێت ـ دەفەرموێ: (قَـدِمَ الـنبيُّ ﷺ المدينـةَ، فرأى اليهودَ تصومُ عاشورا ء، فقالَ: ما هذا؟ قالوا: يومٌ صـالحٌ، نجّـى اللّـهُ فيهِ موسَى وبني إسرائيلَ مِنْ عَدُوِّهم، فَـصامَهُ موسَـى. فقـالَ ﷺ: أنـا أحَـقُّ

---

[١] البخاري: كتاب الصوم – باب صيام يوم عاشوراء (٣ / ٥٧) ومسلم: كتـاب الصيام - بـاب صوم يوم عاشوراء بـرقم (١٢٦) (٢ / ٧٩٥) والموطأ: كتـاب الـصيام – بـاب صيـام يـوم عاشوراء برقم (٣٤) (١ / ٢٩٩) وأحمد في "المسند" (٤ / ٩٥ ).

[٢] البخاري، بألفاظ متقاربة: كتـاب الـصوم – بـاب صـيام يـوم عاشـوراء (٣ / ٥٧) وبـاب وجـوب صـوم رمـضان (٣ / ٣١) ومـسلم: كتـاب الـصيام – بـاب صـوم يـوم عاشـوراء بـرقم (١١٣) (٧٩٢/٢) وأبـو داود: كتـاب الـصوم – بـاب في صـوم يـوم عاشـوراء بـرقم٢٤٤٢ (٢ / ٨١٧) والترمذي: كتاب الصوم – باب ما جاء في الرخصة في تـرك صـوم يـوم عاشـوراء بـرقم٧٥٢) وقال: وهو حديث صحيح (٣ / ١١٨) والدارمي: كتاب الصيام – باب في صيام يـوم عاشوراء عـن ابـن عمـر) (٢ / ٢٢) والموطـأ: كتـاب الـصيام – بـاب صـيام يـوم عاشـوراء بـرقم (٣٣) (٢٩٩/١) وأحمد في "المسند" (٢ / ٥٧، ١٤٣) (٦ / ١٦٢)

بموسَى منكُم. فَصامَهُ، وأمَرَ بصيامِه )[١] متفق عليه کـه پێغەمبـەر ﷺ تەشـريفی هێنا بۆ مەدينە، ديتی جولەکە رۆژانی عاشورا بەڕۆژوو دەبن. فەرمووی: ئەمـە چييە؟ ووتيان: رۆژێکی مەزنە، چونکە خوای گەورە لـەو رۆژەدا سـيدنا موسـاو بەنو ئيسرائيلی لە دەست دوژمنەکانيان قوتار کرد، ئيتر ئەويش تێيـدا بـەڕۆژوو دەبوو. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: حەقە من سوورتر بم لەسەر گرتنی، چونکە ئەو حەقی لەسەر من زۆر ترە. بۆيە بەڕۆژوو بوو، و فەرمانی بەڕۆژوو بوونيشيدا

- ئەبو موسای ئەشعەری - خوا لێی رازی بێت - فەرمووی: (كـانَ يـومَ عاشـوراء تُعظمُهُ اليهودُ، وتَتّخِذُهُ عيداً، فقالَ رسولُ اللّه ﷺ: صومُوهُ أنتُمْ )[٢] متفق عليـه واتە: جولەکە رۆژی عاشـورايان بـە پـيرۆزو مـەزن دەگـرت دەيـانکردە جـەژنی خۆيان. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئێوەش تێيدا بەڕۆژوو بن.
- بە لەفزێکی تريش ريوايەت کـراوە کـە پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: (لَـئِنْ بَقِيـتُ إلى قابِلٍ، لأصومَنَّ التاسعَ. يعني، مَعَ يومِ عاشوراء )[٣] رواه أحمد، ومسلم ) واتە: ئەگـەر تـا ساڵی داهاتوو زيندوو بمێنم، تێيدا بەڕۆژوو دەبم و رۆژێکی تريشی لەگەڵدا دەگرم.

٤- **رۆژووی شەعبان:** پێغەمبەر ﷺ زۆرينـەی رۆژەکـانی شـەعبانی دەگـرت. وەکو چۆن نوێـژی سـوننەتی پـێش فـەرزەکان دەکـرد ئـاواش شـەعبانی دەکـردە پێشەکی رۆژووی رەمەزان، تا ئومەتەکەشی بە هاتنی شەعبان خۆيان بۆ رەمـەزان ئامادەکەن و لە رووی دەروونيانەوە ئامادەباشی بۆ پێشوازی کردنی دەربڕن..

---

[١] البخاري: كتـاب الصـوم – باب صيـام يـوم عاشوراء ( ٣ / ٥٧ ) ومسلم: كتـاب الـصيام - بـاب صوم يوم عاشوراء برقم ( ١٢٧ ) ( ٢ / ٧٩٥ ) وابن ماجـه: كتـاب الـصيـام – بـاب صيام يـوم عاشوراء برقم ( ١٧٣٤ ) ( ١ / ٥٥٢ ).

[٢] البخاري: كتـاب الصـوم – بـاب صيـام يـوم عاشـوراء ( ٣ / ٥٧ ) ومـسلم: كتـاب الـصيـام – باب صوم يوم عاشوراء برقم ( ١٢٩ ) ( ٢ / ٧٩٦ ).

[٣] مسلم: كتـاب الـصيام – بـاب أي يـوم يـصام في عاشـوراء بـرقم ( ١٣٤ ) ( ٢ / ٧٩٨ ) وأحمـد في "المسند" ( ١ / ٢٢٤، ٢٢٥، ٣٤٥ ) وابن ماجه: كتـاب الصيـام – بـاب صـيام يـوم عاشـوراء برقم ( ١٧٣٦ ) ( ١ / ٥٥٢ ) .

خاتوو عائیشه ـ خوا لێی رازی بێت ـ دەفەرموێ: (ما رأيتُ رسولَ اللّه ﷺ استَكمَلَ صيامَ شَهْرٍ قَطُّ، إلا شَهْرَ رمضانَ، وما رأيتُهُ في شَهْرٍ أكثرَ منهُ صياماً، في شَعْبَانَ)[1] رواه البخاري ومسلم، واتە: نەمدی پێغەمبەر ﷺ هیچ مانگێك ـ جگە لە رەمەزان ـ هەمووی بەرۆژوو بێت، نەشمدی لە هیچ مانگێکدا وەکو شەعبان زۆر بەرۆژوو بێت. واتە زۆرینەی رۆژەکانی شەعبان بەرۆژوو دەبوو.

ئوسامەی کوڕی زەید ـ خوا لێیان رازی بێت ـ لە پێغەمبەری ﷺ پرسی: (يا رسولَ اللّه، لَم أرَكَ تَصوم مِنْ شَهرٍ مِن الشهورِ، ما تصومُ مِن شعبانَ! قالَ: ذلكَ شَهرٌ يَغفَلُ الناسُ عنهُ بينَ رَجَبٍ ورمضانَ، وهو شهرٌ تُرفعُ فيهِ الأعمالُ إلى ربِّ العالمينَ، فأحِبُّ أنْ يُرفَعَ عملي وأنا صائم)[2] رواه النسائي، وصححه ابن خزيمة) واتە: ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی نابینم لە هیچ مانگێکدا وەکو مانگی شەعبان زۆر تێیدا بەرۆژوو بیت؟ فەرمووی: شەعبان مانگێکە ـ کە لە نێوان رەجەب و رەمەزاندایە ـ خەڵکی لێی بێ ئاگان. ئەمە مانگێکە (راپۆرتی) کردەوەی بەرەو خوای پەروەردگار تێدا بەرز دەبێتەوە، منیش حەز دەکەم لەو کاتەی کردەوەمی تێدا بەرز دەبێتەوە بەرۆژوو بم.

بەڵگەیەك لەسەر ئەوە نییە کە پانزەی شەعبان تایبەت کرێت بۆ رۆژوو گرتن چاکتر بێت. هەروەها ئەو بۆچوونەی شافیعیەکان لاوازە، کە فەرموویانە لە نیوەی دووەمی مانگی شەعباندا نابێت کەس بەرۆژوو بێت. ئەو فەرموودەی دەیهێننەوە زەعیفە.

---

[1] البخاري: كتاب الصوم – باب صوم شعبان (٣ / ٥٠)، ومسلم: كتاب الصيام – باب صيام النبي صلى الله عليه وسلم في غير رمضان، واستحباب ألا يخلى شهراً عن صوم، برقم (١٧٥) (٢/٨١٠) وأبو داود: كتاب الصوم – باب كيف كان يصوم النبي صلى الله عليه وسلم، برقم (٢٤٣٤) (٢ / ٨١٣) والنسائي بمعناه: كتاب الصيام – باب التقدم قبل رمضان وذكر اختلاف الناقلين لخبر عائشة فيه برقم (٢١٧٩، ٢١٨٠) (٤/١٥١) والموطأ: كتاب الصيام _ باب جامع الصيام، برقم (٥٦) (١ / ٣٠٩).

[2] النسائي: كتاب الصوم _ باب صوم النبي صلى الله عليه وسلم، برقم (٢٣٥٧) (٤ / ٢٠١)، وأحمد في "المسند" (٥ / ٢٠١)، وابن خزيمة بمعناه: كتاب الصيام – باب في صفة صوم النبي صلى الله عليه وسلم... (٣ / ٣٠٤، ٣٠٥).

٥- **رۆژووی مانگە حەرامەکان:** مانگە حەرامەکان بریتین لە (ذو القعْدَة، ذو الحِجَّة، موحەڕڕەم، ڕەجەب) بۆیە پێیان ووتراوە مانگە حەرامەکان، چونکە عەرەبەکان لە پێش ئیسلامدا لەو مانگانەدا شەڕی ناوخۆییان تێدا حەرام کرد بوو. زۆر رۆژوو گرتن تێیاندا سوننەتە.

کابرایەکی هۆزی باهیلە گێڕایەوە، کە چووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و پێی ووت: (**ما أكَلْتُ طَعَاماً إلا بليلٍ منذُ فارقْتُكَ. فقالَ رسولُ اللّه ﷺ: لِمَ عذبْتَ نفسَكَ؟! . ثمَّ قالَ: صمْ شَهْرَ الصبرِ، ويوماً من كلِّ شَهرٍ. قال: زدني؛ فإنَّ بي قوةً. قالَ: صمْ يومينِ. قالَ: زِدني. قالَ: صمْ مِن الحَرَمِ واتْرُكْ، صمْ مِن الحَرَمِ واتْرُكْ، صُمْ مِن الحَرَمِ واتْرُكْ. وقال بأصابعِهِ الثلاثة، فضَمَّها، ثم أرسلها**)[1] رواه أحمد، وأبو داود، وابن ماجه، والبيهقي بسند جيد) واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من هەر ئەو پیاوەم، کە ساڵی رابوردوو هاتمە خزمەتت. پێغەمبەر ﷺ لێی پرسی: پار رواڵەت و سەرو سیمات رێكوپێك بوو، چی وا گۆڕیویتی؟ کابرا ووتی: لەو کاتەوەی جەنابتم جێ هێشتووە، بەشەو نەبێت نانم نەخواردووە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بۆچی وا خۆت ئەشکەنجە داوە؟! پاشان فەرمووی: مانگی ئارامی و خۆگرتنەوەکە (واتە رەمەزان) بەرۆژوو بەو، ئینجا لە هەر مانگەو رۆژێکی تر. کابرا ووتی: تواناو تاقەتم هەیە زیاترم بۆ دانێ. فەرمووی: رۆژێك لە مانگێکی حەرام بگرەو رۆژێکی لێ گەڕێ. کابرا ووتیەوە: تواناو تاقەتم هەیە زیاترم بۆ دانێ. فەرمووی: باشە، دوو رۆژ بگرەو رۆژێکی بەردە. دیسان ووتیەوە: تواناو تاقەتم هەیە هی ترم بۆ دانێ. فەرمووی: لە مانگە حەرامەکان سێ رۆژ بگرەو سێ رۆژ واز لێ بێنە، سێ رۆژ بگرەو سێ رۆژ واز لێ بێنە، سێ رۆژ بگرەو سێ رۆژ واز لێ

---

[1] أبو داود: كتاب الصوم – باب في صوم أشهر الحرم برقم (٢٤٢٨) (٢ / ٨٠٩، ٨١٠)، وابن ماجه: كتاب الصوم – باب صيام أشهر الحرم، برقم (١٧٤١) (١ / ٥٥٤)، وهو ضعيف، انظر: ضعيف أبي داود (٤١٩).

بێنە. سێ پەنجەی پیرۆزیشی پێکەوە جووت کردبوو کە سێ جاری ئاوا دەفەرموو، پاشان پەنجەکانی لێك جوێ کردنەوە.

رۆژووی مانگی رەجەب هیچ ئەفزەلیەتیەکی تری بەسەر مانگەکانی تردا نییە، تەنها ئەوە نەبێت، کە یەکێکە لە مانگە حەرامەکان. بەڵگەیەکی واش لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ نەهاتووە، کە فەزڵێکی تایبەت بۆ رەجەب دیاری کات. ئەوی دەربارەشی هەیەو دەیگێڕنەوە هێندە بەهێز نییە بە بەڵگە بۆی بهێنرێنەوە.

ئیمامی ئیبنول حەجەر دەفەرموێ: حەدیسێکی سەحیحی وا نەلەسەر گەورەیی و نەلەسەر رۆژوو گرتنی مانگی رەجەب نییە، چ هەمووی چ رۆژانێکی تایبەتیی یان لەسەر شەونوێژی شەوێکی ئەو مانگە، بەتایبەت نەهاتووە، کە بۆ پشت پێ بەستن بشێت..

**٦- رۆژووی دووشەممان و پێنج شەممان:** ئەبو هورەیرە - خوا لێی رازی بێت - دەفەرموێ: (**أنَّ النبيَّ ﷺ كانَ أكثرَ ما يصومُ الاثنينَ والخميسَ، فقيلَ لَهُ؟ ) فقال: إنَّ الأعمالَ تُعْرَضُ كلَّ اثنينٍ وخميسٍ، فيغفرَ اللّهُ لِكُلِّ مسلمٍ، أو لكلِّ مؤمنٍ، إلا المُتَهاجِرينَ، فيقولُ: أخِّرْهما**)[1] رواه أحمد بسند صحيح واتە: پێغەمبەر ﷺ زۆرترین رۆژووی دووشەممان و پێنج شەممان پێ دەبوو. کە پێیان ووتەوە (واتە پرسیاریان لێکرد) فەرمووی: رۆژانی دووشەممان و پێنج شەممان کارو کردەوە نیشان دەدرێن. خوای گەورەش لە هەموو موسوڵمانێك، یان لە هەموو ئیماندارێك خۆش دەبێت، جگە لەو دوو کەسەی کە لێك زویر بوون و هات و چۆیان لە یەکتر بڕیووە، دەربارەی ئەوان دەفەرموێ: دواتریان خەن.

---

[1] أحمد في "المسند" (٢ / ٣٢٩) بلفظه، وبدون لفظة: "إلا المتهاجرين، فيقول: أخرهما" أحمد (٥ / ٢٠٤، ٢٠٥، ٢٠٩).

له سەحیحی موسلیمدا هاتووه كه (أَنَّهُ ﷺ سُئِلَ عَنْ صومِ يومِ الاثنينِ؟ فقالَ: ذاك يومٌ وُلِدْتُ فيه، وأنزلَ عليَّ فيه. أي: نزل الوحي عليَّ فيه)[1] واته: دەربارەی رۆژووی دوو شەممان له پێغەمبەریان پرسی. فەرمووی: ئەوه ئەو رۆژەیه، كه تێیدا له دایك بووم و، كه تێیدا بۆم هاتۆته خوارەوه، واته: وەحیم بۆ هاتۆته خوارەوه تێیدا.

٧- **رۆژووی سێ رۆژ له هەر مانگێك:** ئەبو ذەڕی غەففاری ـ خوا لێی رازی بێت ـ دەفەرموێ: (أَمَرَنَا رسولُ اللّهِ ﷺ أنْ نَصومَ مِنَ الشَّهْرِ ثلاثةَ أيَّامِ البيضِ؛ ثلاثَ عَشْرَةَ، وأربعَ عشرةَ، وخمسَ عشرةَ، وقال: هي كصومِ الدَّهْرِ)[2] رواه النسائي، وصححه ابن حبان واته: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ دەكردین، كه سێ رۆژی شەوه گەشدارەكان(ئەو شەوانەی مانگی چواردەیان تێدا دەردەكەوێت) له هەر مانگێك بەرۆژوو بین؛ سێزدەو چواردەو پازدەی مانگ، چونكه وەكو رۆژووی ساڵەكه وان.

هەروەها له پێغەمبەری نازدارەوە ﷺ ریوایەت كراوە، كه له سەرەتای هەر مانگێك یەكەمین رۆژانی شەممەو یەك شەممەو دوو شەممان و، له كۆتایی مانگەكەش رۆژانی سێ شەممەو چوار شەممەو پێنج شەممان بەرۆژوو دەبوو. له كامڵ بوونی هەر هەیڤێكیش (واته له ناوەڕاستی هەموو مانگێكدا) سێ رۆژی بەرۆژوو

---

[1] مسلم: كتاب الصيام – باب استحباب صيام ثلاثة أيام من كل شهر، برقم (١٩٨) (٨٢٠/٢) وأحمد في "المسند" (٥ / ٢٩٧، ٢٩٩).

[2] أبو داود: كتاب الصوم – باب في صوم الثلاث من كل شهر، برقم (٢٤٤٩) (٢ / ٨٢١)، والنسائي بدون لفظ: "هي كصوم الدهر": كتاب الصوم – باب ذكر الاختلاف على موسى بن طلحة في الخبر في صيام ثلاثة أيام من الشهر، برقم (٢٤٢٣، ٢٤٢٢) (٤ / ٢٢٢)، وابن ماجه، من طريق عبد الملك بن المنهال، عن أبيه، عن رسول اللّه صلى الله عليه وسلم: كتاب الصيام – باب ما جاء في صيام ثلاثة أيام من كل شهر، برقم (١٧٠٧) (١ / ٥٤٤)، وأحمد في "المسند" (٥ / ٢٧)، والإحسان بترتيب صحيح ابن حبان: باب صوم التطوع، برقم (٣٦٤٨) (٢٦٥/٥).

دەبوو، جگە لەوەی کە هەموو یەکەمین پێنج شەممەی هەموو مانگێك و دووشەممەکەی دوای ئەوو دوو شەممەی دووەمی دوای ئەویش بەرۆژوو دەبوو[١].

٨- **رۆژە نارۆژ بەرۆژوو بوون:** ئەبو سەلەمەی کوڕی عبد الرحمن لە عبد اللەی کوڕی عەمردوە ـ خوا لێیان رازی بێت ـ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (قالَ لي رسولُ اللّه ﷺ: **لَقَدْ أُخْبِرْتُ أنَّكَ تقومُ الليلَ وتصومُ النَّهارَ؟** قالَ: قلتُ: يا رسولَ اللّه، نَعَمْ. قالَ: **فَصمْ وأفْطِرْ، وصلِّ ونَمْ، فإنَّ لجَسَدِكَ عليكَ حَقّاً، وإنَّ لزوجِكَ عليكَ حَقّاً، وإنَّ لِزَوْرِك عليكَ حقّاً،** وإنَّ بِحَسْبِكَ أنْ تصومَ من كلِّ شهرٍ ثلاثةَ أيامٍ. قالَ: فشدَّدتُ، فشدَّدَ عليَّ. قالَ: فقلتُ: يا رسولَ اللّه، إني أجدُ قوةً. قالَ: **فَصمْ مِنْ كُلِّ جُمُعَةٍ ثلاثةَ أيامٍ.** قالَ: فشدَّدْتُ، فَشَدَّدَ عليَّ. قال: فقلتُ: **يا رسولَ اللّه، إني أجدُ قوةً.** قالَ: صمْ يَومَ نبيِّ اللّهِ داودَ، **ولا تَزِدْ عليه. قلتُ: يا رسول اللّه، وما كانَ صيامُ داودَ عليه السلام؟ قالَ: كانَ يصومُ يوماً، ويفطرُ يوماً**)[٢]. رواه أحمد، وغيره) واتە: هەواڵم پێ گەیشتووە کە شەونوێژ دەکەیت و بەرۆژوو دەبیت. فەرمووی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا وایە. فەرمووی: دەی کەوایە رۆژێك بگرەو رۆژێك بخۆ، نوێژیش بکەو بشخەوە، چونکە جەستەشت مافی لەسەرتە، خێزانت مافی لەسەرتە، میوانەکانت مافیان لەسەرتە. لە مانگێکدا سێ رۆژی

---

[١] الترمذي، مختصراً: كتاب الصوم/ باب ما جاء في صوم الاثنين والخميس، برقم (٧٤٦)(١١٣/٣)، وأبو داود مختصراً – كتاب الصيام – باب في صوم الثلاث من كل شهر، برقم (٢٤٥٠)(٨٢٢/٢)، والنسائي: كتاب الصيام – باب كيف يصوم ثلاثة أيام، برقم (٢٤١٥، ٢٤١٨)(٤/ ٢٢٠، ٢٢١)، وأحمد في "المسند" (١ / ٤٠٦)، وانظر _ لزاماً _ تمام المنة (٤١٤، ٤١٥).

[٢] البخاري بمعناه: كتاب الصوم – باب صوم داود عليه السلام (٣ / ٥٢) ومسلم: كتاب الصيام – باب النهي عن صوم الدهر.. برقم(١٨٢)(٨١٣/٢) وأحمد في المسند (٢٢٥/٢، ٢٠٠، ١٩٨، ١٩٧، ١٩٥).

بەرۆژوو بیت بەستە. دەفەرموێ: من لەسەر خۆمم توند کرد ئەویش توندی کرد. ووتم: ئەی پێغەمبەر خوا، من هێزو تینێك لە خۆمدا شك دەبەم، فەرمووی: دەی هەر هەفتەی سێ رۆژی بگرە. دیسان من لەسەر خۆمم توندتر کرد ئەویش توندتری کرد. ووتمەوە: ئەی پێغەمبەری خوا هێزو تینێکی زیاتر لە خۆمدا دەبینم. ئەویش فەرمووی: جا کەوا بوو رۆژووەکەی داوود پێغەمبەر بگرە، بەلاّم زیاتری نەکەیت. دەفەرموێ: ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا رۆژووەکەی سیدنا داوود سەلامی خوای لێ بێت چۆن بووە؟ فەرمووی: رۆژێك بەرۆژوو دەبوو، رۆژێکی دەخوارد.

هەر لە عبد اللەی کوڕی عەمرەوە ـ خوا لێی رازی بێت ـ گێڕراوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أحبُّ الصيامِ إلى اللّهِ صيامُ داودَ وأحبُّ الصلاةَ إلى اللّهِ صلاةُ داودَ، كانَ ينامُ نِصفَهُ، ويقومُ ثُلُثَهُ، وينامُ سُدُسَهُ، وكان يصومُ يوماً، ويَفطِرُ يوماً)[1] واتە: پەسەندترین رۆژوو لای خوای گەورە رۆژووەکەی داوود بوو، پەسەندترین نوێژیش لای خوای گەورە هەر نوێژەکەی داوود بوو، نیوەی شەوەکە دەخەوت، سێ یەکی بۆشەو نوێژ داددنا، ئینجا شەش یەکی دەنووستەوە، رۆژێکیش بەرۆژوو دەبوو، رۆژێکیشی دەخوارد.

---

[1] ابن ماجه: كتاب الصيام – باب ما جاء في صيام داود، عليه السلام، برقم (١٧١٢) (١ / ٥٤٦) وأحمد في "المسند" (٢/١٦٠).

## رۆژووەوانی سوننەت بۆی هەیە بیشکێنێت

١ـ ئوم هانیء ـ خوا لێی رازی بێت ـ فەرمووی: (أنَّ رسولَ اللّه ﷺ دَخَلَ عليها يومَ الفتحِ، فأتيَ بشرابٍ فشَرِبَ، ثم ناولَني، فَقُلْتُ: إني صائمةٌ. فقالَ: إنَّ المتطوِّعَ أميرٌ على نفسه؛ فإنْ شِئْتِ فَصومي، وإنْ شِئْتِ فأفطِري)[1]. رواه أحمد، والدارقطني، والبيهقي، وورواه الحاكم، وقال: صحيح الإسناد، ولفظه: (الصائمُ المتطوِّعُ أميرُ نفْسِه؛ إنْ شاءَ صامَ، وإنْ شاءَ أفطَرَ)[2] واتە پێغەمبەر ﷺ لە رۆژی فەتحی مەککەدا تەشریفی هێنایە ماڵی خواردنەوەیەکیان بۆ هێنا ئەویش خواردیەوە، پاشان دایە من، ووتم: قوربان من بەرۆژووم. فەرمووی: دەتوانێت بیشکێنیت، هەروەکو، کە دەتوانیت بەردەوام بیت.. ئیمامی حاکمیش ریوایەتی کردووەو فەرموویەتی: صحيح الاسناد، بەڵام بەو لەفزەی ترە، کە دەفەرموێ: (رۆژوودوانی سوننەت ئەمیری نەفسی خۆیەتی، گەر وویستی رۆژووەکەی بەردەوام دەکات، گەر وویستیشی بیشکێنێت، بۆی هەیە.

٢ـ ئەبو جوحەیفە ـ خوا لێی رازی بێت ـ فەرمووی: (آخَى النبي ﷺ بينَ سلمانَ وأبي الدَّرْدَاء، فزارَ سلمانُ أبا الدرداء، فرأى أمَّ الدرداء متَبَذِّلَةً، فقال لها: ما شأنُك؟ قالتْ: أخوكَ أبو الدرداء، ليسَ لهُ حاجَةٌ في الدُّنيا. فجاءَ أبو الدَّرْداء، فَصنَعَ لَهُ طعاماً، فقالَ: كُلْ، فَإنِّي صائم. فقالَ: ما أنا بآكِلٍ، حتى تأكُلَ. فأكَلَ، فَلَمَا كانَ الليلُ، وذَهَبَ أبو الدَّرداءيُقومُ، قالَ نَمْ. فنامَ، ثُمَّ

---

[1] الدارقطني: كتاب الصيام – باب الشهادة على رؤية الهلال برقم (٧) (١٧٣/٢و١٧٤) والبيهقي: كتاب الصيام – باب صيام المتطوع والخروج منه قبل تمامه (٢٧٦/٤ـ٢٧٧) وأحمد في "المسند" (٦ / ٣٤٣).

[2] الحاكم في "المستدرك": كتاب الصوم – باب صوم التطوع (١ / ٤٣٩)، وقال: صحيح الإسناد، ولم يخرجاه، وتلك الأخبار المعارضة لم يصح منها شيء. ووافقه الذهبي.

ذَهَبَ، فقالَ: نَمْ. فلما كانَ في آخرِ الليلِ، قالَ: قُم الآنَ. فَصلّيَا، فقالَ لهُ سلمانُ: إنَّ لِربِّكَ عليكَ حقّاً، ولنَفْسكَ عليكَ حقّاً، ولأهلكَ عليكَ حقّاً، فأعْطِ كُلَّ ذي حَقٍ حَقَّهُ. فأتَي النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرَ لَهُ ذلكَ، فقالَ النبيُّ ﷺ: صدَقَ سَلْمَانُ)[1] رواه البخاري، والترمذي واته: پێغەمبەر ﷺ (له مەدینه که برایەتی لە نێوان کۆچکەرەکان و پشتیوانەکاندا کرد) سەلمان و ئەبود دەردائی کردە برا. جارێك سەلمان چووە لای ئەبود دەرداو، دیتی ئوم دەردائی خێزانی جل و بەرگێکی خراپو نارێکی لەبەر بوو، لێی پرسی: ئەوە بۆچی وایت؟ فەرمووی: غێر ئەبود دەردائی براتە! پێویستی دنیایی نەماوە! کە ئەبود دەرداو هاتەوە سیدنا سەلمان خواردنێکی بۆ دروست کردو فەرمووی لێکرد. ئەبود دەردا فەرمووی: بەرۆژووم. سەلمان فەرمووی: ناخۆم تا تۆ نەخۆیت. ئیتر ئەویش خواردی. کە شەو داهات، ئەبود دەردا هەستا شەو نوێژ بکات، سەلمان فەرمووی: بخەوەرەوە. ئینجارۆیشت، دواتر هاتەوەو پێی فەرمووەوە بخەوەرەوە، تا نزیك بوو شەو کۆتایی بێت، ئینجا خەبەری کردەوەو پێی فەرموو: فەرموو ئێستا هەستە. ئیتر پێکەوە شەونوێژەکەیان کرد. دوایی سەلمان پێی فەرموو: خوای گەورە مافی بەسەرتەوە هەیە، نەفسی خۆت مافی بەسەرتەوە هەیە خێزانەکەت مافی بەسەرتەوە هەیە. هەر یەکەیان مافی خۆیان بدەرێ. ئینجا کە هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و بۆی گێڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سەلمان راستی کردووە.

٣ـ ئەبو سەعیدی خودری -خوا لێی رازی بێت- فەرمووی: (صنَعْتُ لِرسُولِ اللّه ﷺ طَعَاماً، فأتَانِي هو وأصحابُهُ، فلمَّا وُضِعَ الطعامُ، قالَ رجلٌ مِن القَومِ: إنِّي

---

[1] البخاري: كتاب الصوم – باب من أقسم على أخيه ليفطر في التطوع، ولم ير عليه قضاء (٣ / ٤٩) وكتاب الأدب – باب صنع الطعام والتكلف للضيف (٨ / ٤٠)، والترمذي: كتاب الزهد – باب حدثنا محمد بن بشار...، برقم (٢٤١٣)، وقال أبو عيسى: هذا حديث صحيح (٤ / ٦٠٨، ٦٠٩).

صائم. فقالَ رسولُ اللّهِ ﷺ: دعاكُم أخوكُمْ، وتَكَلَّفَ لَكُمْ". ثُمَّ قالَ: أفْطِرْ، وصمْ يوماً مَكَانَهُ، إنْ شِئْتَ)[1] رواه البيهقي بإسناد حسن، كما قال الحافظ. واته: جارێك خواردنم بۆ پێغەمبەر ﷺ دروست كرد بوو، خۆی و یاوەرەكانی تەشریفیان هێنا، كە خواردنەكە دانرا، كابرایەك ووتی: من ناخۆم بەڕۆژووم. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو برایەتان دەعوەتی ئێوەی كردووەو زەحمەتی كێشاوە. پاشان فەرمووی: رۆژووەكەت بشكێنە، دوایی ئەگەر حەزت كرد رۆژێكی تر بیگرەرەوە. زۆربەی ئەهلی عیلم رایان وایە كە ئەو كەسەی رۆژووی سوننەتی گرتووەبۆی هەیە كەی وویستی بیشكێنێت، بەلاّم پێشیان چاك بووە بیگرێتەوە. لەبەر ئەم حەدیسانەی كە هێنامانەوە.

[1] البيهقي: كتاب الصيام – باب التخيير في القضاء إن كان صومه تطوعاً (٤ / ٢٧٩).

# ئادابی رۆژوو گرتن

بۆ رۆژووەوان چاکترە ئەم ئاداب و نەریتانەی خوارەوە بگرێتە بەر:

١- **پارشێو (یان پاششێو کردن)**: هەموو ئوممەتی ئیسلام لەسەر ئەوەن کە پارشێو کردن خێرە، کەس بە نەکردنی گوناهبار نابێت. ئەنەس خوا لێی رازی بێت دەفەرمویّ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (**تَسَحَّرُوا؛ فإنَّ في السَّحور بركة**)[١] رواه البخاري، ومسلم. واتە: پارشێو بکەن، چونکە خواردنی پارشێو بە فەڕو (بەرەکەت)ە. سَحُور: خواردن و خواردنەوەی پارشێوە، سُحُور: کاتەکەیەتی.

المقدادی کوڕی مەعد یەکریب دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (**عَلَيكُمْ بهذا السَّحور؛ فإنه هو الغذاءُ المبارَكُ**)[٢] رواه النسائي بسند جيد واتە: پارشێو بکەن، پارشێو بە بەرەکەتە.. چونکە رۆژووەوان بەهێزتر دەکات و توانا و ووزەی زیاتری پیّ دەبەخشێت، کە رۆژووەکەی لا ئاسانتر دەکات.

هەر چەندە حەدیسەکە بە شێوەی فەرمان دەفەرمویّ: پارشێو بکەن، بەڵام ابن المنذر کۆڕا (ئیجماع)ی زانایاین نەقلّ کردووە، کە پارشێو کردن فەرز نییە.

---

[١] البخاري: كتاب الصوم – باب بركة السحور في غير إيجاب.... (٣ / ٣٧، ٣٨)، ومسلم: كتاب الصيام – باب فضل السحور وتأكيد استحبابه، واستحباب تأخيره وتعجيل الفطر، برقم (١٠٩٥) (٢/٧٧٠) والترمذي: كتاب الصوم – باب ما جاء في فضل السحور، برقم (٧٠٨) (٣/٧٩) والنسائي: كتاب الصوم – باب الحث على السحور، برقم (٢١٤٦) (٤ / ١٤١) وابن ماجه: كتاب الصيام – باب ما جاء في السحور، برقم (١٦٩٢) (١ / ٥٤٠) والدارمي: كتاب الصوم – باب في فضل السحور (٢ / ٦)، وأحمد في "المسند" (٣ / ٩٩، ٢١٥، ٢٢٩، ٢٥٨،٢٨١)، والبيهقي: كتاب الصيام – باب استحباب السحور (٤ / ٢٣٦).

[٢] النسائي: كتاب الصيام – باب تسمية السحور غذاء، برقم (٢١٦٤) (٤ / ١٤٦)، وانظر "الإحكام في الأحكام"، للأستاذ مصطفى بن سلامة.

چی پارشێوه؟: پارشێو به هەر برە خواردن وخواردنەوەیەك بێت، کەم یان زۆر حسێبە، با بە قوومە ئاوێکیش بێت. چونکە ئەبو سەعیدی خودری ـ خوا لێی رازی بێت ـ گێراوێتییەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (**السَحورُ بركةٌ فلا تَدْعُوهُ، ولَو أنْ يَجْرَع أحدُكُمْ جَرْعَةَ ماءٍ؛ فإنَّ اللّهَ وملائكتَهُ يُصلُّونَ على المُتَسحِّرِينَ**)[١] رواه أحمد. واتە: پارشێو بەرەکەتە، وازی لێ مەهێنن، با قوومە ئاوێکیش بێت بیخۆنەوە، چونکە خواو فریشتانی خوا دوعا بۆ ئەو کەسانە دەکەن، کە پارشێو دەکەن.

کاتی پارشێو: هەر لە نیوە شەوەوە، تا سپێدەی بەیانی بە کاتی پارشێو حسێبە، تا دواتر خرێت خێرترە. زەیدی کوری ثابت ـ خوا لێی رازی بێت ـ فەرمووی: (**تَسَحَّرْنَا مَعَ رسولُ اللّه ﷺ، ثُمَّ قُمْنَا إلى الصلاة، قلتُ: كَمْ كانَ قَدْرُ مَا بينهمَا؟ قالَ: خَمْسِينَ آيةً**)[٢] رواه البخاري، ومسلم واتە: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ پارشێومان کرد، پاشان هەستاین بۆ نوێژ، ووتم: ماوەی نێوانیان چەند بوو؟ فەرمووی: ئەوەندەی، کە پەنجا ئایەت بخوێنیت.

عەمری کوری مەیموون دەفەرموێ: (**كانَ أصحابُ محمدٍ ﷺ أعجَلَ النَّاسِ إفطاراً، وأبْطَأهُمْ سُحوراً**)[٣] رواه البيهقي بسند صحيح. یاوەرانی پێغەمبەر ﷺ لە هەموو کەس بەپەلەتر بوون بۆ رۆژوو شکاندن، لە هەموو کەسیش زیاتر پارشێویان دوا دەخست[٤].

---

[١] أحمد في "المسند" (٣/١٢،٤٤) بلفظه، ورواه مختصراً (٥ / ٣٧٠).

[٢] البخاري: كتاب الصوم – باب قَدْرِ كَمْ بين السحور وصلاة الفجر (٣ / ٣٧)، ومسلم: كتاب الصيام – باب فضل السحور وتأكيد استحبابه، واستحباب تأخيره، وتعجيل الفطر، برقم (٤٧) (٢/٧٧١)

[٣] البيهقي: كتاب الصيام – باب ما يستحب من تعجيل الفطر وتأخير السحو(٤/٢٣٨).

[٤] وفي البخاري: لا يزال الناس بخير، ما عجلوا الفطر (مع الفتح ٤ / ٢٣٤) "الفتح(٤/٢٣٤)، ورواه أحمد في "المسند" (٥ / ١٧٢).

## گومان له سپێدەی بەیانی:

ئەگەر کەسێك کەوتە گومانی ئەوەوە،کە ئایا بوو بە بەیانی، یان هێشتا کات ماوە، دەتوانێت هەر بخوات و بخواتەوە، تا لە سپێدەی بەیانییەکە دڵنیا دەبێت. با کار بە گومانەکەی نەکات، چونکە خوای پەروەردگار کۆتایی هێنانی خواردن و خواردنەوەی پارشێوی بە جویێ کردنەوەی رەشی شەو لە سپێتی بەیانی دیاری کردووە. وەك دەفەرموێ: (**وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ**)٢ البقرة: ١٨٧ واتە: بخۆن‌و بخۆنەوە تا هێڵی سپی سپێدەتان بۆ لە رەشێتی شەو جویێ دەکرێتەوە.

کابرایەك بە ئیبنو عەبباسی ووت: من کە پارشێو دەکەم، دەخۆم و دەخۆمەوە تا ئەو ساتەی گومان دەکەم، کە ئیتر بەیانە. ئیتر دەست هەڵ دەگرم. فەرمووی: تا گومانت مابێت هەر بخۆو بخۆرەوە، کە گومانت نەما دەست هەڵگرە..

ئیمامی ئەبو داوود دەفەرموێ: ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل فەرمووی: ئەگەر گومانی لە هاتنی بەیانی کرد، لە خواردن و خواردنەوەی خۆی بەردەوام دەبێت، تا گومانی نامێنێت. ئەمەش رای ئیبنو عەبباس و عطاء وئەوزاعی‌و ئیمامی ئەحمەدە. (**فتح الباري ١٧٢/٤**).

ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ: یاوەرانی ئیمامی شافیعی رایان هەموو لەسەر ئەوەیە کە کەسێك کە بەگومانە لە سپێدە، بۆی هەیە بخوات و بخواتەوە، تا لە بەیانی بوون دڵنیا دەبێت..

٢- **پەلەکردن لە بەربانگ:** چاکتر وایە رۆژووەوان هەر کە دڵنیا بوو خۆر ئاوا بووە (چ بە دیتنی خۆی، چ بە هەواڵی موسوڵمانێکی راستگۆ، چ بەوەی گەیشتە ئەوەی کە خۆر ئاوا بووە)، رۆژووەکەی بشکێنێت. سەهلی کوڕی سەعد دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (**لا يزالُ الناسُ بخيرٍ، ما عَجّلوا**

الفطر)[١] متفق عليه. واته: خەڵكی هەر لە خێرو بەرەكەتدا دەبن مادام پەلە لە رۆژوو شكاندنەكەیان بكەن.. چونكە دیانو جولەكەكانی زەمانی پێغەمبەر ﷺ كاتێك رۆژوویان دەشكاند، كە ئەستێرە دەردەكەوت!

كە خوای گەورە دەفەرمویٚ: (أَتِمُّواْ الصيام إِلَى اللَّيْلِ) ٢ البقره/١٨٧ واتە رۆژووەكەتان بەردەوام كەن تا شەو، ئاشكرایە كە سەرەتای شەو بە خۆرئاوا بوون دەست پیٚ دەكات.

ئەمما ئەگەر هەورو چەرە دوكەڵ و شتی وا بوو، نابێت پەلە لە بەربانگ بكات، ئەمیان بە پێچەوانەی پارشێوەوەیە، پارشێو بەردەوام بوونی شەوە، بەلاّم بەربانگ كۆتایی هاتنی ماوەی رۆژووەكەیە، ئەگەر پەلەی كردو بەربانگی كردەوە، دوایی بۆی دەركەوت، كە هێشتا خۆر ئاوا نەبووە، ئەوە قەرزار بووەو دەبێت ئەو رۆژە بگرێتەوە.. ئەمەش بە پێی رێسایەكی شەرعی گرنگە، كە دەفەرمویٚ: (الاصلُ بقاءُ ما كانَ على ما كانَ) واتە: ئەسڵ ئەوەیە ئەو شتە لەسەر چ حاڵەتێك بووە، هەر وا لەسەر ئەو حاڵەتەی ماوە.

باشتر وایە رۆژووەكەی بە یەك، یان سیٚ، یان پێنج دەنكە خورما (مەبەست لەوەیە تاك بێت) بشكێنێت، ئەگەر نەبوو، بە ئاو. چونكە ئەنەس -خوا لێی رازی بێت- دەفەرمویٚ: (كانَ رسولُ اللّهِ ﷺ يُفْطِر على رُطَباتٍ قبلَ أن يُصلي، فإنْ

---

[١] البخاري: كتاب الصوم – باب تعجيل الإفطار (٣ / ٤٧) ومسلم: كتاب الصيام – باب فضل السحور برقم (٤٨) (٢ / ٧٧١) وابن ماجه: كتاب الصيام – باب ما جاء في تعجيل الإفطار برقم (١٦٩٧) (١ / ٥٤١) والترمذي: كتاب الصوم – باب ما جاء في تعجيل الإفطار برقم (٦٩٩) (٣ / ٧٣) وقال أبو عيسى: حديث حسن صحيح والدارمي: كتاب الصوم - باب في تعجيل الإفطار (٢ / ٧)، والموطأ: كتاب الصيام – باب ما جاء في تعجيل الفطر برقم (٦) (١ / ٢٨٨) والبيهقي: كتاب الصيام – باب ما يستحب من تعجيل الفطر وتأخير السحور (٤ / ٢٣٧) وأحمد في "المسند" (٥ / ٣٣١، ٣٣٤، ٣٣٩، ٣٣٧، ٣٣٦).

لَمْ تَكُنْ، فعلَى تَمَرَاتٍ، فإنْ لَمْ تَكُنْ، حَسَا حَسَوَاتٍ مِنْ مـاءٍ )[١] رواه أبـو داود، والحـاكم وصحَّحَهُ، والترمذي وحسَّنَهُ. واته: پێغەمبەر ﷺ پێش نوێژ، بە چەند دەنکە قەسپێك (خورمای تەڕ ) رۆژووەكەی دەشكاند، گەر دەست نەكەوتایە، بە چەند دەنكە خورمایەك. گەر ئەویش نەبوایە، ئەوە هەر چەند قوومە ئاوێكی دەخواردەوە.

سولەیمانی كوڕی عامر ـ خوا لێی رازی بێت ـ دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ( إذا كانَ أحدُكُمْ صائماً، فَلْيُفطِرْ علَى التَّمْرِ، فإنْ لَمْ يَجِدْ التَّمْرِ، فعلى الماءِ؛ فإنَّ الماءَ طَهُورٌ )[٢] رواه أحمد، والترمذي، وقال: حسن صحيح. ئەگەر كەسێكتان بەڕۆژوو بوو، با بە خورما رۆژووەكەی بشكێنێت، ئەگەر خورمای دەست نەكەوت با بە ئاو بیشكێنێت، چونكە ئاو پاككەرەوەیە.

ئێرە جێی ئەوە نیە، كە هەندێك لەو بەڵگە زانستیانە باسكەین، كە لەسەر خورما - لە كۆنو نوێدا- خراونەتە ڕوو، بەڵام ئەوەندە بزانین، كە یەك دەنكە خورما بۆ رۆژووەوان، دەبێتە مایەی گەش بوونەوەی گەدەو ریخۆڵەی‌و ووزەی لەشی، چونكە ئەو كالۆرییە گەرمایەی تێدایەتی بەسە بۆ بەرۆژوو بوونەوەی سبەینێشی!! بۆیە ئیمامی ئیبنول القەییم دوای باسێكی زۆری لە خورما، دەفەرموێ: خورما هەم میوەیە، هەمو خۆراكە، هەم دەرمانە، هەم شیرینیە! دكتۆر سەبری القبانی دەڵێت: خورما چەندین جۆر شەكری تێدایە، هەر بە گەیشتنی بە لیك، جۆرێك لە شەكرەكەی

---

[١] أبو داود: كتاب الصوم – باب ما يُفطر عليه برقم (٢٣٥٦) (٢/٧٦٤) والترمذي: كتاب الصوم – باب ما جاء ما يستحب عليه الإفطار برقم (٦٩٦) (٣/٧٠) وقال: هذا حديث حسن غريب، وأحمد في "المسند" (٣ / ١٦٤) والحاكم: كتاب الصيام (١/٤٣٢) وقال: صحيح على شرط مسلم.

[٢] الترمذي: كتاب الصوم – باب ما جاء ما يستحَبُّ عند الإفطار برقم (٦٩٥) وقال: هذا حديث حسن صحيح (٣ / ٦٩، ٧٠) وأبو داود: كتاب الصوم – باب ما يُفطر عليه برقم (٢٣٥٥) (٢ / ٧٦٤) وابن ماجه: كتاب الصيام – باب ما جاء على ما يستحب الفطر برقم (١٦٩٩) (١ / ٥٤٢) والدارمي: كتاب الصوم – باب ما يستحب الإفطار عليه (٢ / ٧) والحاكم: كتاب الصوم – باب استحباب الإفطار على التمر (١ / ٤٣٢) وقال: هذا حديث صحيح على شرط البخاري ولم يخرجاه. ووافقه الذهبي والبيهقي: كتاب الصيام – باب ما يفطر عليه ٤/٢٣٨).

دەگاتە خوێن و بەسەر ئەندامانی لەشدا بە هۆی خوێنەکەوە دابەش دەبێت، ئەمەش یەعنی تەعویز دانەوەی ئەو شەکرەی لە خوێندا کەم بۆتەوە! ئەمما ئاوەکە: ئەویش هەر موعجیزەیەکی تری پێغەمبەری نازدارە ﷺ چونکە زانستی پزیشکی ئەمڕۆ بۆ تەندروستی پتەوو بۆ ڕێچیم و خۆ لەڕ کردن دەڵێت: لە خوڕێنی (ناشتەی پێش نان خواردنی بەیانی) ئاو بخۆرەوە چونکە گەدەو ڕیخۆڵەکان پاك دەکاتەوە..

ئەم حەدیسە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بۆ ڕۆژووەوان وا چاکترە کە پێش نوێژی شێوان و بەو شێوەیە ڕۆژووەکەی بشکێنێت، ئینجا کە نوێژەکەی کرد خواردن دەخوات. ئەگەر خواردنەکە ئامادە بوو، دەتوانێت پێشتر بیخوات و دوایی نوێژەکەی بکات. چونکە ئەنەس ـ خوا لێی رازی بێت ـ دەفەرموێ کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إذا قُدِّمَ العَشَاء، فابْدَءوا به قبلَ صلاةِ المغرِبِ، ولا تَعْجِلوا عن عَشَائكم)[1] رواه الشيخان واتە: ئەگەر خواردنی شێوان (ئێوارە) پێش نوێژ دانرا، دەست بەو بکەن. خواردنەکە دوا مەخەن.

**٣- دوعای کاتی ڕۆژوو و بەربانگ:** ئیبنو ماجە لە عبد اللەی کوڕی عەمرەوە ـ خوا لێیان رازی بێت ـ گێڕایەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (**إنّ للصائمِ عندَ فطْرِه دَعوةً ما تُرَدُّ**)[2] **وكان عبد الله إذا أفطر، يقولُ: اللهُمَّ إنِّي أسْأُلكَ بِرَحْمَتِكَ التي وَسِعَتْ كلّ شَيءٍ، أنْ تَغْفِرْ لِي**) واتە: ڕۆژووەوانکاتی بەربانگەکەی دوعایەکی هەیە کە بێ وەڵامی خوایی نابێت(یەعنی دوعاکەی

---

[1] البخاري: كتاب الأذان – باب إذا حضر الطعام وأقيمت الصلاة (١ / ١٧١)، ومسلم بلفظ: "إذا قُرِّبَ العَشاء، وحضرت الصلاة": كتاب المساجد ومواضع الصلاة، برقم (٦٤) ٣٩٢/١) وأحمد بمعناه (٢ /١٤٨).

[2] ابن ماجه: كتاب الصيام – باب في الصائم لا تُرَدُّ دعوته برقم (١٧٥٣) (٥٥٦/١) وفي "الزوائد": إسناده صحيح لأن إسحاق بن عبيد الله بن الحارث قال النسائي: ليس به بأس. وقال أبو زرعة: ثقة. وذكره ابن حبان في "الثقات" وباقي رجال الإسناد على شرط البخاري وهو ضعيف انظر: "الإرواء" (٩٢١).

گیرا دەبێت). بۆیە عبد الله کە بەربانگی دەکردەوە دەیفەرموو: خوایە بەو ڕەحمەت و بەزەییەت کە هەموو شتێکی گرتۆتەوە، لێم خۆش بیت.

حەدیسی سەلماویش هەیە، کە پێغەمبەر ﷺ لە کاتی بەربانگ کردنەوەیدا دەیفەرموو: (ذَهَبَ الظمأ، وابْتَلَّتْ العُرُوقُ، وثَبُتَ الأجْرُ، إنْ شاءَ اللّهُ تعالى)[1] واتە: تینوێتی چوو، دەمارەکان تەڕ بوونەوە و پاداشتەکەش ان شاء الله نوسراوە، یان دەیفەرموو: (اللهُمَّ لَكَ صمْتُ، وعَلَى رِزقِكَ أفْطَرْتُ)[2] واتە: خوایە بۆ تۆ بەڕۆژوو بووم، و لەسەر رزق و رۆزی تۆش بەربانگم کردەوە.

ئیمامی ترمذیش بە سەنەدێکی (حَسَن) گێڕاویتیەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ثلاثةٌ لا تُرَدُّ دعوتُهُم؛ الصائمُ حتى يَفْطُرَ، والإمامُ العادلُ، والمظلومُ)[3] واتە: سێ کەس دوعایان گیرایە: رۆژووەوان، تا بەربانگ دەکاتەوە، پێشەوای دادپەروەر، ستەم لێکراو..

**٤- خۆگرتنەوە لە هەرچی لە رۆژوو ناوەشێتەوە:** رۆژوو لەو خواپەرستییە مەزنانەیە کە خاوەنەکەی زۆر لە خوای گەورە نزیك دەکاتەوە. بۆیە خوای گەورەش ئاوا لەسەر خەڵکی فەرز کردووە، وویستویێتی بەو رۆژووە دڵ و دەروونی خەڵکی پێ پارسەنگ کات. وویستویێتی لەسەر خۆ کۆنترۆڵ کردن و خێرخوازی رایان بهێنێت. بۆیە حەتمەن دەبێت رۆژووەوان خۆی لە هەموو هەڵس و

---

[1] أبو داود: كتاب الصوم - باب القول عند الإفطار برقم (٢٣٥٧) (٢ / ٧٦٥) ونسبه المنذري للنسائي، والبيهقي : كتاب الصيام – باب ما يقول إذا أفطر (٤ / ٢٣٩) وهو ضعيف، انظر: الارواء (٩٢١)

[2] أبو داود: كتاب الصوم – باب القول عند الإفطار، برقم (٢٣٥٨) (٢/٧٦٥) والبيهقي: كتاب الصيام – باب ما يقول إذا أفطر (٤ / ٢٣٩)

[3] الترمذي: كتاب الدعوات – باب في العفو والعافية، برقم (٣٥٩٨) (٥ / ٥٧٨) وقال: هذا حديث حسن. وكتاب صفة الجنة – باب ما جاء في صفة الجنة ونعيمها، برقم (٢٥٢٦) (٦٧٢/٤) وقال في ه: هذا حديث ليس إسناده بذاك القوي، وليس هو عندي بمتصل، وقد روي هذا الحديث بإسناد آخر عن أبي مُدِلَّة، عن أبى هريرة، عن النبي، وابن ماجه: كتاب الصيام _ باب في الصائم لا تردّ دعوته، برقم (١٧٥٢) (١ / ٥٥٧) وأحمد في "المسند" (٢ / ٣٠٥، ٤٤٥).

کەوت و رەفتارێك بگرێتەوە، کە رۆژووەکەی پێ لەکەدار بکات، یان سیرەی خۆی پێ عەیبدار بکات. دەبێ ئەوەندە رۆژووەکەی بە پاکی راگرێت، تا لە تەرازووی چاکەکانیدا کێشێکی هەبێت. بەرەو ئاستی تەقواو پارێزکاری بەرزی کاتەوە، تا مەبەست لە رۆژوو فەرز کردنەکە بێتە دی: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ)٢البقرة /١٨٧.

رۆژوو گرتن هەر خۆگرتنەوە نییە لە خواردن و خواردنەوە، بەڵکو خۆگرتنەوەشە لە هەموو ئەوانەی، کە خوای گەورە یاساغی کردوون یان بەرهەڵستی کردنی کردوون.

ئەبوهورەیرە ـ خوا لێی رازی بێت ـ دەگێرێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ليسَ الصيامُ مِن الأكلِ والشُربِ، إنمَا الصيامُ مِن اللغوِ والرَّفَث، فإنْ سابّكَ أحَدٌ أو جَهِلَ عليكَ، فَقُلْ: إنِّي صائم، إنِّي صائم)[1] رواه ابن خزيمة، وابن حبان، والحاكم، وقال: صحيح على شرط مسلم. واتە: رۆژوو گرتن هەر خۆگرتنەوە لە خواردن و خوارنەوە نیە، بەڵکو خۆگرتنەوەشە لە قسەی هەلەق و مەلەق و زۆر بلێیی، لە سوعبەت و شەڕە قسە، ئەگەر کەسێك جنێوی پێدایت، یان رەفتارێکی ناشیرینی جاهیلییانەی بەرامبەرت نواند، بڵێ: من بەرۆژووم بەرۆژووم.. دیسان ئەبو هورەیرە ـ خوا لێی رازی بێت ـ گێرایەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مَنْ لَمْ يَدَع قَولَ الزُّورِ والعَمَلَ بهِ، فَلَيسَ للهِ حاجةٌ في أنْ يَدَعَ طعامَهُ وشَرابَهُ)[2]، واتە:

---

[1] الحاكم: كتاب الصوم – باب من أفطر في رمضان ناسياً، فلا قضاء عليه ولا كفارة (١/٤٣٠،٤٣١) وقال: هذا حديث صحيح على شرط مسلم، ولم يخرجاه. ووافقه الذهبي، والإحسان بترتيب صحيح ابن حبان: كتاب الصوم – باب آداب الصوم، برقم (٣٤٧٠) (٥/١٩٨) صحيح ابن خزيمة: كتاب الصوم – باب النهي عن اللغو في الصيام...، برقم(١٩٩٦) (٣/٢٤٢) (٢).

[2] البخاري: كتاب الصوم – باب من لم يدع قول الزور(٣/٣٣) والترمذي: كتاب الصوم – باب التشديد للغيبة للصائم، برقم (٧٠٧) (٣ / ٧٨) وقال: هذا حديث حسن صحيح. وابن ماجه: كتاب الصيام – باب ما جاء في الغيبة، والرفث للصائم، برقم (١٦٨٩) (١ / ٥٣٩)، وأبو داود: كتاب الصوم – باب الغيبة للصائم، برقم (٢٣٦٢)، وأحمد في "المسند" (٢ / ٤٥٢، ٥٠٥).

ئەو کەسەی واز لە شایەتی درۆو کاری نادروست نەهێنێت، خوا پێویستی بەو نییە واز لە خواردن و خواردنەوەکانی بهێنێت، مەبەست لەوەیە کە مادام دەڵێت لەبەر خاتری خوا رۆژووم گرتووە، با هەر لەبەر خاتری خواش واز لە کارو رەفتاری ناشیرین بهێنێت.. شایەتی درۆ: جگە لە درۆکە، غەیبەت و دووزمانی و جنێوو ئەوانەش دەگرێتەوە..

دیسان هەر لەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (**رُبَّ صائم ليسَ لَهُ مِنْ صيامه إلا الجوعُ، ورُبَّ قائمٍ ليسَ لَهُ مِنْ قيامه، إلا السَّهَرُ**)[١] رواه النسائي، وابن ماجه، والحاكم، وقال: صحيح على شرط البخاري واتە: رۆژووەوانی وا هەیە جگە لە برسێتی هیچی تری لە رۆژووەکەی بۆ نامێنێتەوە! هەروەها شەونوێژ خوێنی وا هەیە لە شەونوێژەکەی تەنها شەوخوونییەکەی بۆ دەمێنێتەوە.

ئەم حەدیسانە کە هەمووی داوای پابەندی پیاوچاکانە دەکەن بە رەفتاری بەرزی رۆژووەوانەو بەرهەڵستی کردەوەی خراپی لێ دەکەن، چونکە گوناح کە لای خوای گەورە شتێکی قەڵب و ناقۆڵاو خراپە، موسوڵمان لە رەمەزاندا بیکات ناشیرینترەیان لە هەندێك جێگای وەکو کەعبە ناشیرینترە.. ئەو هەڕەشانە هەر بۆ سوڵحان و ساغ بوونەوەیە بۆ خوای گەورە، ئەگینا رۆژوو بەو شتانە ـ گەر هەمووشی بکات ـ هەر بەتاڵ نابێتەوە..

٥- **سیواك:** سیواك کردن بۆ رۆژووەوان شتێکی چاکەو خێرە، بە کار هێنانیشی چ لە بەیانیاندا بێت یان عەسرو ئێواران هیچ ئیشکالی نییە. ئیمامی ترمذی دەفەرموێ: ئیمامی شافیعی هیچ لاری لە بەکار هێنانی سیواك بۆ رۆژووەوان

---

[١] الحاكم: كتاب الصوم (١ / ٤٣١) وقال: هذا حديث صحيح على شرط البخاري، ولم يخرجاه. ووافقه الذهبي، وابن ماجه: كتاب الصيام - باب ما جاء في الغيبة، والرفث للصائم، برقم (١٦٩٠) (١ / ٥٣٩) وفي "الزوائد": إسناده ضعيف، والدارمي: كتاب الصوم – باب في المحافظة على الصَّوْم (٢ / ٣٠١)، وأحمد في "المسند" (٢ / ٤٤١).

نەبوو، چ لە سەرەتای رۆژدا بێت چ لە کۆتایی. چونکە پێغەمبەر ﷺ بەرۆژوو بووەو سیواکیشی بەردەوام بەکارهێناوە[1]

## ٦- سەخاوەت و قورئان خوێندن: سەخاوەت و خێرو کردن و قورئان

خوێندن هەموو کاتێك هەر خێرو چاکەیە، بەڵام لە رەمەزاندا جەخت لێکراو ترن.

ئیمامی بوخاری لە ئیبنو عەبباسەوە ـ خوا لێیان رازی بێت ـ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ لە هەموو کەس سەخی و خێرەومەندتر بوو، لە رەمەزانیشدا ـ لەو کاتانەی کە دیداری جوبرەئیلی دەبوو ـ لە هەموو کاتێکی تری خێرەومەندتر دەبوو. جوبرەئیلیش هەموو شەوێکی رەمەزان دەهاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و قورئانەکەی پێ موراجەعە دەکردەوە. پێغەمبەر ﷺ لە خێرایی و گشتگیری خێرەومەندێتیدا دەتووت شنە بایە، خێرایەو هەموو کەسێکی دەگرتەوە[2].

## ٧- زۆر کردنی خواپەرستی لە دە رۆژی دوایی رەمەزاندا:

١- ئیمامی بوخاری و موسلیم دەگێڕنەوە، کە خاتوو عائیشە ـ خوا لێی رازی بێت ـ فەرمووی: (أنَّ النبيَ ﷺ: كانَ إذا دَخَلَ العَشْرُ الأواخِرِ، أحْيَى الليلَ، وأيقَظَ أهْلَهُ، وشَدَّ المئزَرَ)[3]، واتە: پێغەمبەر ﷺ کە دە رۆژی کۆتایی رەمەزان

---

[1] أبو داود: كتاب الصوم – باب السواك للصائم برقم (٢٣٦٤) (٢ / ٧٦٨) والترمذي: كتاب الصوم – باب ما جاء في السواك للصائم برقم (٧٢٥) (٣ / ٩٥) وقال أبو عيسى: حديث حسن. ونكر البخاري في "صحيحه" هذا الحديث معلقاً في الترجمة، فقال: ويذكر عن عامر بن ربيعة....: كتاب الصوم – باب سواك الرطب، واليابس (٣ / ٤٠)، وأحمد في" المسند" (٣ / ٤٤٥)..

[2] البخاري: كتاب الصوم – باب أجود ما كان النبي صلى الله عليه وسلم يكون في رمضان(٣٣/٣) ومسلم: كتاب الفضائل – باب كان النبي صلى الله عليه وسلم أجود الناس بالخير، من الريح المرسلة برقم (٥٠) (٤ / ١٨٠٣) والنسائي: كتاب الصيام – باب الفضل والجود في شهر رمضان برقم (٢٠٩٥) (٤ / ١٢٥) وأحمد في "المسند"(٣٦٣) (١/ ٢٨٨، ٣٦٣).

[3] البخاري: كتاب الصوم – باب فضل العمل في العشر الأواخر من رمضان (٣ / ٦١)، ومسلم: كتاب الاعتكاف – باب الاجتهاد في العشر الأواخر من شهر رمضان، برقم (٧) (٢ / ٨٣٢)، وابن ماجه: كتاب الصوم – باب في فضل العشر الأواخر من رمضان، برقم (١٧٦٨) (١ / ٥٦٢)،=

دادەهات، شەوانی (بەشەو نوێژ و پەرستن) زیندوو دەکردەوەو ماڵ و منداڵی بەخەبەر دێناو پەشتەماڵی لێ توند دەکردەوە (واتە خۆی گورج دەکردەوە تا خۆی بۆ خواپەرستی تەرخان کات).

لە ریوایەتەکەی ئیمامی موسلیمدا هاتووە کە: (**كانَ يَجْتَهِدُ في العَشْرِ الأواخِرِ، ما لا يَجْتَهِدُ في غَيرِهِ**)[١] واتە: ئەو ردنج و هەوڵەی لە دە رۆژی دوایی رەمەزاندا دەیدا لە هیچ کاتێکی تریدا نەیدەدا.

٢- ترمذی لە عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە ـ خوا لێی رازی بێت ـ دەگێڕێتەوە: (**كانَ رسولُ اللّه ﷺ يُوقِظُ أَهْلَهُ في العَشْرِ الأواخِرِ ويَرْفَعُ المِئْـزَرَ**)[٢] واتە: کە پێغەمبەر ﷺ لە دە رۆژی ئاخری رەمەزاندا ماڵ و منداڵی بەخەبەر دەهێناو پەشتەماڵی لێ توند دەکردەوە..

---

=وأبو داود: كتاب الصلاة _ باب في قيام شهر رمضان، برقم (١٣٧٦) (٢ / ١٠٥)، والنسائي: كتاب قيام الليل وتطوع النهار – باب الاختلاف على عائشة في إحياء الليل، برقم (١٦٣٩) (٣ / ٢١٧، ٢١٨) وأحمد في "المسند" بألفاظ متقاربة (٦ / ٤٠، ٤١، ٦٦، ٦٨، ١٤٦).

[١] مسلم: كتاب الاعتكاف – باب الاجتهاد في العشر الأواخر من شهر رمضان، برقم (٨) (٢ / ٨٣٢)، والترمذي: كتاب الصوم – باب مِنْهُ، برقم (٧٩٦) (٢ / ١٥٢)، وقال: هذا حديث حسن صحيح غريب، وابن ماجه: كتاب الصيام – باب في فضل العشر الأواخر من شهر رمضان، برقم (١٧٦٧) (١ / ٥٦٢)، وأحمد في" المسند" (٦ / ٨٢، ١٢٣، ٢٥٦).

[٢] الترمذي بدون لفظة: "ويرفع المئزر": كتاب الصوم – باب منه برقم (٧٩٥) (٣ / ١٥٢) وقال المحقق: لم يخرجه من أصحاب الكتب الستة، سوى الترمذي، وأحمد في "المسند" (١ / ٩٨، ١٢٨، ١٣٣، ١٣٧)

# ئەوی بۆ رۆژووەوان حەلاڵە

١- **خۆ شتن:** ئەبو بەكری كوڕی عبد الرحمن لە یەكێك لە یاوەرانی پێغەمبەردوە ﷺ گێڕاوێتیەوە كە فەرموویەتی: (**وَلَقَدْ رأيتُ رسولَ اللّهِ ﷺ يَصبّ علَى رأسِهِ الماءَ، وهو صائم؛ مِن العَطَشِ، أو مِنْ الحرّ**)[١] رواه أحمد، ومالك، وأبو داود بإسناد صحيح واتە خۆم پێغەمبەرم بینی ﷺ لەبەر تینوێتی یا لەبەر گەرما ئاوی دەكرد بە سەری خۆیداو بەڕۆژووش بوو.

لە هەردوو كتێبـــی سەحیحی بوخاری و موسلیم هاتووە، كە خاتوو عائیشە -خوا لێی رازی بێت ـ دەیفەرموو: (**أنَّ النبيَّ ﷺ: كانَ يصبح جُنُباً، وهو صائم، ثُمَّ يَغْتَسِلُ**)[٢] واتە: كە لەش گران دەبوو (یەعنی لە جەنابەتدا دەبوو)، بەڕۆژوو دەبوو، ئینجا خۆی دەشت.

ئەگەر لە كاتی خۆشتنی رۆژووەوان یان خۆ نقووم كردنی لە ئاودا، ئاو پەڕییە قوڕگی ـ كە خۆی مەبەستی نەبوو بێت ـ رۆژووە كەی پێ ناشكێت..

٢- **چاو رشتن و قەترە:** چاو رشتن بە كل یان بە شتی تر، هەروەها بەكار هێنانی قەترەو مەڵحەم و شتی تر، تامی لەو رێیەوە بگاتە قوڕگ یان نەگات كار لە رۆژووەكە ناكات و پێی ناشكێت.

ئەمەش رای شافیعیەكانەو ئیبنول مونذر فەرموویەتی، كە بۆچوونی (**عطاء** و ئەلحەسەن و نەخەعی و ئەوزاعی و ئەبو حەنیفەو ئەبو **ثَور**) ە و لە یاوەرانیشدا ئەمە رای ئیبنو عومەرو ئەنەس و ئیبنو ئەبی ئەوفایە. مەزهەبی داوودیش هەر

---

[١] أبو داود: كتاب الصوم – باب الصائم يُصبُّ عليه الماء من العطش، ويبالغ في الاستنشاق، برقم (٢٣٦٥) (٢ / ٧٦٩)، والموطأ: كتاب الصيام – باب ما جاء في الصيام في السفر برقم (٢٢) () (١ / ٢٩٤) وأحمد في "المسند" (٣ / ٤٧٥، ٤ / ٦٣، ٥ / ٣٧٦، ٣٨٠، ٤٣٠،٤٠٨).

[٢] البخاري بنحوه: كتاب الصوم – باب الصائم يصبح جنباً (٣ / ٣٨)، ومسلم: كتاب الصيام – باب صحة صوم من طلع عليه الفجر، وهو جنب، برقم (٧٦) (٢/٧٨٠) وأحمد في "المسند" (٦ / ٣٤، ٣٦، ٣٨)، والدارمي: كتاب الصوم – باب فيمن أصبح جنباً، وهو يريد الصوم (٢ / ١٣).

وایــه.. ئیمــامی تــرمـذی دەفــەرموێ: هــیچ حەدیــسێکی راســت دەربــارەی ئــەم مەسەلەیە نییە. فەتوای ئیمامی ئیبن تەیمییەو ئیبنول القەییمیش هەر ئاوایە..

**٣ـ ماچ کردن و دەسبازیی:** بۆ هەر کەسێك (ژن یان پیــاو) کــە بتوانێــت خۆی کۆنترۆڵ بکات، جائیزە. بەو رادەیەی نەگەنە ئاستی رەحەتبوون..

خاتوو عائیشە ـ خوا لێی رازی بێت ـ فەرمووی: (**كانَ النبيُّ ﷺ يقبِّـلُ وهـوَ صـائم، ويُباشِـرُ وهـو صـائم، وكـانَ أمْلَكَكُـمْ لإرْبِـهِ**)[1] واتــە: جــار هــەبوو کــە پێغەمبەر ﷺ بەرۆژوو دەبوو، خێزانی خۆی مــاچ دەکــرد، یــان دەســبازی لەگــەڵ دەکرد، بەڵام ئەو لە هەمووتان زیاتر ئارەزووی خۆی دەگرت. ســەیرکە خێزانــەکانی پێغەمبەر ﷺ لە روون کردنەوەی ووردترین ئەحکامی شــەرعدا ـ بــا تایبــەت بــە خۆشیان بوو بێــت ـ روونیــان کردۆتــەوە. یباشر: لــە (بَشَرَة) ەوە هــاتووە واتــە بەرکەوتنی پێستی ئەم و پێستی ئەو..

عومەری کوڕی خەتتاب ـ خوا لێی رازی بێت ـ فــەرمووی: (**هَشَشْتُ يومـاً، فَقَبَّلْتُ وأنا صائم، فأتيتُ النبيَّ ﷺ، فقلتُ: صنَعْتُ اليومَ أمْراً عَظيمَـاً؛ قبّلْـتُ وأنا صائم. فقالَ رسولُ اللهِ ﷺ: أرأيتَ لَو تَمَضْمَتْ بِمَاءٍ، وأنتَ صائم؟ قُلْـتُ: لا بأسَ بذلكَ؟ قالَ: ففيمَ**)[2] واتە: رۆژێك بە رۆژوو بووم و جولاّ بووم، خێزانەکــەم

---

[1] البخاري: كتاب الصوم – باب المباشرة للصائم (٣ / ٣٨، ٣٩)، ومسلم: كتــاب الـصيام - بــاب بيان أن القبلة في الـصوم ليـست محرمـة علـى مـن لم تحـرك شهوتــه، بـرقم (٦٥،، ٦٦، ٦٨) (٧٧٧/٢) الترمـذي: كتــاب الـصوم – بــاب مـا جـاء في مباشـرة الـصائم، بـرقم (٧٢٨، ٧٢٩) (٩٨/٣)، وابـن ماجـه: كتــاب الـصيام – بــاب مـا جـاء في المباشـرة للـصائم، بـرقم (١٦٨٧) (٥٣٨/١) والموطأ بمعناه: كتاب الصيام – باب ما جاء في التـشديد في القبلـة للـصائم، بـرقم (١٨) (١ / ٢٩٣) وأحمد في "المسند" (٦ / ٤٠، ٤٢، ٤٤، ١٢٦، ١٢٨، ١٥٦).

[2] أبو داود: كتاب الـصوم – بـاب القُبلـة للـصائم، بـرقم (٢٣٨٥) (٢ / ٧٧٩)، والـدارمي: كتــاب الـصوم – باب الرخصة في القبلـة للـصائم (٢ / ١٣) وأحمـد في "المـسند" (١ / ٢١) والحـاكم في "المستدرك": كتاب الصوم – باب جواز القبلة للصائم (١ / ٤٣١) وقـال: هـذا حـديث صـحيح على شرط الشيخين ولم يخرجاه. ووافقه الذهبي، وفي "نيل الأوطار": صححه ابـن خزيمـة وابـن حبان (٢٨٧/٤).

ماچ کرد، دوایی هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ عەرزم کرد (پێم ووت): ئەمڕۆ شتێکی گەورەم کردووە! بەڕۆژووم و خێزانەکەمم ماچ کردووە! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: باشە ئەگەر ئاوت لە دەمت رادایە و غەرغەرەت پێ بکردایە، هیچت لەسەر دەبوو؟ ووتم: نەخێر، ئەوە هیچی تێدا نییە. فەرمووی: ئیدی ئەو پرسیارەت چییە؟ ! واتە ئەو کارە هیچ کارتێکردنێکی لەسەر بەتاڵ کردنەوەی رۆژوو نییە..

ئیبنول مونذر دەفەرموێ: لەو یاوەرانەی رایان لەسەر ئەوە داوە، کە ماچکردن رۆژوو ناشکێنێت: عومەری کوڕی خەتتاب و ئیبنو عەبباس و ئەبو هورەیرەو خاتوو عائیشە ـ خوا لێیان رازی بێت ـ لە تابعینیشدا عەتاو و شەعبی و ئەلحەسەن و ئەحمەدو ئیسحاق، رەحمەتی خوایان لێ بێت..

لە مەزهەبی حەنەفی و شافیعیو حەنبەلی دا، ئەگەر کەسێك بزانێت ماچەکە بکات ئارەزووی دەجولێت، باش نییە بیکات، ئەمما کەسێك بزانێ ئارەزووی پێی ناجولێت ئەوە قەیدی ناکات. بەلاّم دەفەرموون نەکردنی چاکترە. هەر چوار مەزهەبەکە دەڵێن: گەر بزانێت بە ماچ کردن و دەستبازیەکە لەوانەیە ئاوی بێتەوە، ئەو کاتە حەرامە بیکات. ابن المنذر نەك هەر رای چوار مەزهەبەکە، بەڵکو کۆڕای زانایانی لەسەر ئەوە نەقڵ کردووە، چونکە لە حەدیسەکەی پێغەمبەردا ﷺ دەفەرموێ: (يترك طعامَهُ وشَرابَهُ وشَهْوَتَهُ مِنْ أجْلي) لەبەر خاتری من واز لە خواردن و خواردنەوەو ئارەزووی دەهێنێت، تا بەڕۆژوو بێت..

ئەم حوکمەش پەیوەندی بە تەمەنەوە نییە! بەڵکو بە ئارەزووەکەوە. ماچ ئارەزووی هەر کەسێك بجولێنیت ـ چ گەنج بێت چ پیری بە گوڕ ـ هەر باشتر وایە خۆی لێ بە دوور بگرێت. ئەمما ئەگەر نەیجولێنێت ـ چ گەنجێکی بی تین بێت چ پیر ـ ئیشکالێکی نییە.

جیاوازی ئەو جێیەش نییە، کە ماچی دەکات، گۆنا بێت، یان لێو یان شوێنی تر.. دەسبازی و دەست لە مل کردنیش هەمان حوکمی ماچ کردنیان هەیە.

٤- **دەرزی (شرینقە) لێدان:** شرینقە لێدان رۆژوو ناشكێنێت و زیانیشی بۆی نییە. لە دەمار بدرێت یان لە سمت یان لە قۆڵ یان لە شوێنی تری لەش.. ئەمانە هیچیان زیان بە رۆژوو ناگەێنن. هەروەها شرینقەی موغەززی رۆژوو ناشكێنێ با بچێتە ناوەوەی سك، چونكە ئەو موغەززییە لە رێی سروشتی خۆیەوە (دەم) نەچۆتە ناوەوە. وەك لە كتێبی (فقه السنة)ی سید سابق دا هاتووە.

٥- **كەڵە شاخ و خوێندان:** كەڵەشاخ گرتن كە شێوازێكی كۆنی خوێن پاڵفتە كردنە لەسەرو پشت بگیرێت یان لە ئەندامی تری لەش، هەروەها خوێندان، بە هەر رێگایەك بێت، بە پێی مەزهەبی حەنەفی ومالیكی و شافیعی جائیزن و زیان بە رۆژوو ناگەێنن. چونكە وەكو ئیمامی بوخاری دەگێرێتەوە: (**احْتَجَمَ النبيُّ ﷺ وهو صائم** )[١] واتە پێغەمبەر ﷺ كەڵەشاخی گرت لە كاتێكدا كە بەرۆژوو بوو. ئەمەش رای ئەبوسعید وئیبنومەسعود و ئوم سەلەمەو حوسەینی كوڕی عەلی و عوروەی كوڕی الزوبەیرو سەعیدی كەڕی جوبەیرە.. ئەمما مەزهەبی حەنبەلی پێی جائیز نییەو لایان رۆژوو بە كەڵەشاخ دەشكێت، نەك هەر رۆژووی ئەو كەسەی كەڵەشاخەكەی بۆ گیراوە، بەڵكو هی ئەو كەسەی، كە كەڵەشاخەكەشی گرتووە، جا ئیتر هیچ لە خوێنی كابرا پەڕیبێتە قورگی ئەم، یان نەپەڕیبێت، ئەوە گرنگ نییە.. بۆیە لای حەنبەلیەكان رۆژوو بە خوێندانیش دەشكێت، مەگەر بڕێكی كەم بێت بۆ فەحس و شتی وا.. كەوا بوو كەڵەشاخ و خوێندان زۆر بێت یان كەم، جائیزە، مەگەر بۆ كەسێك و لە كاتێكدا كار بكاتە سەر تین و توانای بەردەوام بوونی

---

[١] البخاري: كتاب الطب – باب أي ساعة يحتجم (٧ / ١٦١) وأبو داود: كتاب الصوم - باب في الرخصة في ذلك، برقم (٢٣٧٢، ٢٣٧٣، ٢٣٧٥) (٢ / ٧٧٣، ٧٧٤) والترمذي: كتاب الصوم – باب الرخصة في الحجامة برقم (٧٧٥، ٧٧٦، ٧٧٧)، وابن ماجه: كتاب الصيام - باب ما جاء في الحجامة للصائم برقم (١٦٨٢) (١ / ٥٣٧) والموطأ: كتاب الصيام – باب ما جاء في حجامة الصائم، برقم (٣٢) (١ / ٢٩٨).

رۆژوو، واته وا بێت دوای خوێندانەکەی هێندە بێ تاقەت ببێت کە ناچاری شکاندنی رۆژووەکەی ببێت، لەم حاڵەتەدا کەڵەشاخ یان خوێندانەکە مەکروهەو باشتر وایە بیخاتە وەختێکی تر.. چونکە ثابتی ئەلبونانی لە ئەنەسی پرسی ـ خوا لێی رازی بێت ـ: (أَكُنتُمْ تَكْرَهُونَ الحِجَامَةَ للصائِمِ، على عهدِ رسولِ اللّه ﷺ؟ قالَ: لا، إلا مِنْ أجْلِ الضَّعْفِ)[1] رواه البخاري، وغيره. واتە: ئەرێ ئێوە لە زەمانی پێغەمبەردا ﷺ پێتان ناخۆش بوو رۆژووەوان کەڵە شاخ بگرێت؟ فەرمووی: نا، مەگەر لەبەر بێتوانایی و لاوازی..

٦- **ئاو لە دەم و لووت وەردان:** رۆژووەوان بۆی هەیە ئاو لە دەم و لووتی وەردا بەو مەرجەی لە رادە دەرنەچێت.

لە قیطی کوڕی یەبرە ـ خوا لێی رازی بێت ـ گێڕایەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (فـإذا اسْتَنْشَقتَ فأبْلغْإلا أنْ تَكُونَ صائماً)[2] رواه أصحاب السنن، وقال الترمذي: حسن صحيح. واتە: کە لووتت پاك دەکەیتەوە، ئاوی زۆر تێوەردە، جگە لەو کاتانەدا نەبێت، کە بەرۆژوویت. ترمذی دەفەرموێ: حديث حسن صحيح.

ئەهلی عیلم فەرموویانە: هەر ماددەیەك لە رێی کونە لووتەوە هەڵ لوشرێتە سکەوە رۆژووی پێ دەشکێت. کەوا بوو رۆژوو بە بنڕووتی دەشکێت (هاڕراوەیەکە دەخرێتە کونی لووتەوە بۆ پژمین) بەم پێوانەش بێ گومان هەر قەترەو دەرمانێك لە رێی لووتەوە بچێتە بۆشایی سکەوە رۆژوو دەشکێنێت. حەدیسیش هەیە کە ئەم رایە بەهێز کات.

[1] هەمان سەرچاوەی پێشووی بوخاری.
[2] أبو داود: كتاب الصوم – باب الصائم يصب عليه الماء من العطش، ويبالغ في الاستنشاق، برقم (٢٣٦٦) (٢ / ٧٦٩)، والترمذي: كتاب الصوم – باب كراهية الاستنشاق للصائم برقم (٧٨٨) (٣ / ١٤٦) وقال: هذا حديث حسن صحيح، والنسائي: كتاب الطهارة - باب المبالغة في الاستنشاق، برقم (٨٧) (١ / ٦٦) وابن ماجه: كتاب الطهارة – باب المبالغة في الاستنشاق برقم (٤٠٧) (١ / ١٤٢) وأحمد في "المسند" (٤ / ٣٣، ٢١١).

ئیبنو قودامە دەفەرموێ: ئەگەر کەسێك لە کـاتی دەسـت نوێـژ گرتنیـدا ئـاو پەڕییە قورگی و چووە خوارەوە (گەر ئـەنجامی زۆر ئـاو رادان، یـان بـە ئەنقەسـت نەبوو) زیانی بۆ رۆژووەکەی نابێت. ئەمەش رای ئـەوزاعی و ئیـسحاق و رایـەکی ئیمامی شافیعییە و هەر ئەوەش لە ئیبنو عەبباسـەوە ـ خـوا لێیـان رازی بێـت ـ ریوایەت کراوە.

ئیمامی مالیك و ئیمامی ئەبو حەنیفە دەفەرموون: ئەگەر هۆشـی لـەوە بـوو، کـە بەرۆژووەو ئاوی زۆر لە دەم و لووتی خۆی رادا، رۆژووەکەی پێ دەشکێت، چونکە خۆی ئاوی زۆر لە دەم و لووتی وەردا وەکو کەسێك وایە بە ئەنقەست ئاوی خواردبێتەوە..

ئیبنو قودامە رای یەکەمی پێ پەسەندترە، با ئاوەکـەش گەیـشتبێتە قـوڕگی، چونکە بە ئەنقەست وای نەکردووە. ئەمە وەکو ئەوەیە، ئەگەر مێشێك خـۆی کـرد بە دەمیداو چووە خوارەوە. هیچیان زیانیان بۆ رۆژووەکە نییە. ئیبنـو عەبباسـیش لە مەسەلەی مێشەکەدا هەروا دەفەرموێ..

٧- **شتی تری جائیز:** ئەو شـتانەی ئەسـتەمە خۆیـان لـێ بپارێزرێـت، کـە نەچنە ناو گەرووەوە، زیانیان بۆ رۆژوو نابێت، وەکو لیك و تۆزو خـۆڵی رێگـاو ئاردو تۆزی دانەوێڵە، کە دەبێژرێنەوە..

ئیبنو عەبباس ـ خوا لێیان رازی بێت ـ دەیفەرموو: تـام کردنـی سـرکە، یـان تامی شتێك، کە دەتـەوێ بیکڕیـت، هیـچی لەسـەر نییـە. بـەم پێوانەشـە، کـە مامۆستایانی ئایینی کورد فەتوایان بۆ چێشت لێنەر داوە، کە بۆی جـائیزە تـامی چێشتەکەی بکات، تا بزانێت تام و خوێی چۆنە.

ئەلحەسەن بـەرۆژوو بـوو، گـوێزی بـۆ کـوڕەزا سـاواکەی دەجـوو، دەیکـرد بـە دەمیەوە. ئیبراهیمیش رێی بەمە داوە.

بنێشت جووین باش نیە، بە تایبـەتی بنێـشتی سـەهم و هـی ئـەم کۆمپانیـا تازانە، کە زۆری مەوادی کیمیاویو تامو بۆنی تێدایە، کە حەتمەن رۆژووەکەی پـێ

دەشكێت ئەمما بنێشتی كوردی، كە زانایانی كورد فەتوایان لەسەری هەیە، كە رۆژوو ناشكێنێت، وایە، هەر بەو مەرجەشە، كە باسیان فەرمووە، بەو مەرجەی پارچەی وردی لێ نەبێتەوەو بكەوێتە گەرووەوە. بەڵام ئیمامانی وەكو شەعبیو نەخەعیو حەنەفییەكان و شافیعیەكان و حەنبەلییەكان فەرموویانە: مەكروهە.

خاتوو عائیشە خانو عەتاو فەتوایان داوە بۆی، كە جووینی جائیزە، چونكە وەكو دانە زیخێك، یان چەوێك وایە خستبێتیە ناو دەمییەوە.

گرنگ ئەوەیە كە هەر شتێك بە لێكچواندن وەكو بنێشتی كوردی بوو، دەشێت بخرێتە ناو دەم بەو مەرجەی پارچەی لێ نەبێتەوە. ئەگەر پارچەیەكی لێ بۆوە و پەڕییە قوڕگەوە (یەعنی چووە خوارەوە) ئەوە رۆژووەكە حەتمەن شكاوە..

ئیبنو تەیمییە دەفەرموێ: بۆن كردنی بۆنی خۆش زیانی بۆ رۆژوو نییە.

ئەمما كل و شرینقەو شاف و(ئەوی دەخرێتە دەرچەی كۆمەوە) و ئەوی دەرمانی نەخۆشە ئەمانە راجوێییەكی لە نێوان شەرعناساندا لەسەرە. هەیانە دەڵێ: جگە لە كل، ئەوانی تر هەموو رۆژوو دەشكێنن. هەشیانە دەڵێ: هیچیان رۆژوو ناشكێنن.. وا دیارە رای كۆمەڵی دووەم بەهێز تر بێت. چونكە رۆژوو كە خواپەرستییەكی ئەوەندە گەورەو گرنگە، ئەگەر ئەم جۆرە شتانە كار تێكردنیان لەسەر هەبوایە پێغەمبەر خوا ﷺ رروونی دەكردەوە، كە رروونیشی بكردایەتەوە یاوەرە بەڕێزەكانی بە دوای خۆیان دەگەیاند، كە هیچ بە كەسی دوای خۆیان نەگەیشتووە مانای وایە هیچیان لەسەر نەهاتووەو دەكەونە بەر شتە جائیزەكان.. ئێمەش كە هیچ حەدیسێكی نە سەحیح و نە حەسەن و نە زەعیف نە موسنەد و نە مورسەلمان چنگ نەكەوتووە، ناتوانین بە رای غەیرە مەعسومێك (كە غەیری پێغەمبەرە ﷺ) حوكمێكی شەرعی لەسەر عیبادەتێك دەركەین..

رۆن و كرێم لە لەش دانو كلو چاو رشتنو بۆن كردنو هەڵمژین (با وەكو دوكەڵی بغوردی ئەسڵیش كە زۆر كۆدەبێتەوە چەوری لە لووتو گەرووشدا

دروست دەكات) و بەمانەش رۆژووەوان رەنگە بەهێزتر ببێت، بەڵام هەر زیانیان بۆ رۆژووەكەی نییە.

زۆر لەم شتانەش لە زەمانی پێغەمبەر ﷺ و یاوەران و نەوەكانی دوایاندا لە تابعین و دوای ئەوانیش هەبوون و كەس گلەیی لە بەكارهێنانیان بۆ رۆژووەوان نەبووە.

ئەگەر لە چارەسەر كردنی نەخۆش بە دەرمان و برین پێچی (وەك دورینەوەی برینێك یان شكاویەكی سەر و دەرمان كردنی یان هۆقنە كردن، كە شلەمەنی لە رێی كۆمەوە دەكرێتە ریخۆڵەكانەوە) دەرمانەكە بە شێوەیەك لە شێوەكان گەیشتە ناو گەدە، هیچ زیانێكی بۆ رۆژووەكە نابێت. چونكە زۆرینەی ئەم دەرمانانە بۆ پاك كردنەوەو دەركردنی پیسی و چەپەڵی لەشە. واتە هۆكاری هێنانە دەرەوەن لەلەش نەك هۆكاری پڕ كردن و تێر كردن..

كەوا بوو بە قیاس لەسەر زۆر لە شتی كۆن كە بۆ رۆژووەوان رێی پێ دراوە وەكو بەكارهێنانی كل و بۆنی بوغرودی چەورو شتی وا، ئەمڕۆش دەتوانرێت فەتوا بۆ بەكارهێنانی شتی نوێی سەردەم بۆ رۆژووەوان بدرێت، لەوانەی كە ئێستا فەتوای زانایاین وەكو شێخی بن بازو ئبنو عوسێمین و زانایانی موعتەبەری ئەزهەر و كۆڕی فەتوایان لەسەرە، هەندێك لەوان، وەك:

هەموو جۆرە قەترەیەك كە لە رێگاكانی لووت و گوێ و چاوەوە بەكاردێت، یان سپرای (بەخخاخ) ی رەبووە و بۆن خۆشكردنی دەم، یان پاك كردنەوەی دان لای پزیشك و بەكارهێنانی مەعجوونی دان، یان بەكارهێنانی ئەو شێوازە پزیشكیانەی دەبێت لە رێی دەرچەی كۆمەوە بەكاربێن وەك هۆقنەو شاف و گولاجی كەم كردنەوەی تاو ئەوانەی سایەق بەكاری دەهێنن..

ئەوەی كە شافیعیەكان فەرموویانە ئەگەر بەڵغەم لە قوڕگیەوە هاتەوە ناودەمی ئیتر نابێت قووتی بداتەوە، ئەگەر وای كرد رۆژووەكەی پێ دەشكێت، وا پێناچێت بەڵگەیان لەسەری هەبێت و راستتر وایە كە پێی ناشكێت..

هەروەها رۆژووەوان بۆی هەیە لە دوای بەربانگەوە تا بەرەبەیانی رۆژی نوێ بخوات و بخواتەوەو جیماع بکات، ئەگەر سپێدەی بەیانی دا (لە زەمانی ئێستای ئێمەدا ئەو ساتەیە، کە گوێی لە بانگی بەیانی دەبێت، یان بە سەعات دەزانرێت) و پارووێك یان خواردنەوەیەکی لە دەمدا بوو، دەبێت تفی کاتەوەو قووتی نەدا. هەروەها جیماعیش ئەگەر لەو ساتەدا پیایدا کرد بوو، دەبێت دەری بهێنێتەوە. ئەگەر وای کرد (واتە تفی کردەوە یان دەری هێنایەوە) رۆژووەکەی دروستە، ئەگەر نا، ئەوە رۆژووەکەی هەر لە سەرەتاوە بەتاڵ بۆتەوە.

ئیمامان بوخاری و موسلیم ـ رەحمەتی خوایان لێ بێت ـ لە خاتوو عائیشەوە ـ خوا لێی رازی بێت ـ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إِنَّ بِلالاً يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ، فَكُلُوا واشْرَبُوا، حَتَّى يُؤَذِّنَ ابنُ أُمِّ مَكْتُومٍ)[1] واتە: بیلالی حەبەشی بانگی یەکەمتان بەشەو بۆ دەدات، ئێوە هەر بخۆن و بخۆنەوە، تا ئەو کاتەی عبد اللەی کوڕی ئوم مەکتوم بانگی دووەم دەدا.

رۆژووەوان بۆی هەیە بە لەش گرانی (کە کورد پێی دەڵێت لەش پیسی) یەوە بێنێتەوە. چونکە لەش گرانی پەیوەندی بە رۆژووەوە نییە. هەر وەکو حەدیسەکەی خاتوو عائیشە باسی کرد، کە پێغەمبەر ﷺ بەرۆژووش بووەو لەشی گران بووە، تا دوایی غوسلی دەرکردووە.

ئەگەر کەسێك بە لەشی پیسەوە بە زەمانی بەرۆژووەوە، تا کاتی بەربانگ مایەوە، گوناحی نەکردنی نوێژەکانی دەگاتێ، بەڵام رۆژوەکەی سەلامەتە.

ئەگەر حەیزدارو زەیستان لە شەودا لە خوێن پاك بوونەوە، بۆیان هەیە رۆژوو بگرن و خۆشتنەکەیان بۆ نوێژ دوا خەن، تا رۆژ دەبێتەوە.

---

[1] البخاري: كتاب الأذان – باب الأذان قبل الفجر (١ / ١٦١)، وكتاب الصوم - باب قول النبي صلى الله عليه وسلم: "لا يمنعنكم من سحوركم أذان بلال" (٣ / ٣٧)، ومسلم: كتاب الصيام – باب بيان أن الدخول في الصوم يحصل بطلوع الفجر، برقم (٣٨) (٢/٧٦٨) وأحمد في "المسند" (٢ / ٩، ٥٧، ١٢٣) (٦/ ٤٤، ٥٤، ٤٣٣).

# بەتاڵ بوونەوەی رۆژوو

پوختە: ئەم سێ خاڵە (دوو فاقانە) فێر بە:

١ـ ئەوی حوکمی شەرعی بەتاڵ بوونەوەی رۆژووی لەسەر بنیات دەنرێت، دوو خاڵە:

أ- هەر جۆرە خواردن و خواردنەوەیەك بگاتە گەدەو ببێتە هۆی چوست چالاك بوونی مرۆڤ، رۆژوودکە بەتاڵ دەکاتەوە.. بە هەر شێوەیەك گەیشتبێتە گەدە..

ب- هەر شتێك لە لەشی رۆژوودوان بهێنرێتە دەرێ و ببێتە هۆکاری لاواز بوون و بێ تاقەت کردنی، دواتریش ببێتە هۆی شکاندنی رۆژووەکە، رۆژووەکەی پێ بەتاڵ دەبێتەوە، چونکە ئیسلام نایەوێت بابای رۆژوودوان، هەم بە رۆژووەکە بێ تاقەت ببێت، هەم بە شتێکی تری ئیزافی، کە دەکرێت دواتر بۆی بکرێت، با ئەو شتە خۆشی لە خۆیدا حەڵاڵ بێت، خۆ حەڵاڵە ژنومێرد لە شەوی رەمەزاندا چەند جیماع دەکەن بیکەن، بەڵام ئەگەر ئەوەندەیان کرد کە نەتوانن سبەینێ بەرۆژوو بن، یان بەرۆژوو بوون بەڵام ناچار بوون بیشکێنن، حەتمەن ئەو زۆر جیماع کردنەیان بۆ جائیز نییە، چونکە بۆتە هۆکاری لەدەست دانی فەرزەکە..

٢ـ ئەوانەی رۆژوو بەتاڵ دەکەنەوە دوو جۆرن:

أ- جۆری یەکەم ئەوانەن، کە زانایان و شەرعناسان رایان لەسەری کۆیەو جیاوازیان لەسەریان نییە، ئەوانیش بریتین لە: لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، خواردن و خواردنەوە بە ئەنقەست، جیماع کردن، هێنانەوەی مەنی و خۆ رەحەت کردن، هاتنە دەرەوەی خوێنی حەیزو نیفاسی ژنان، شرینقەی خۆراك و خۆ ڕشاندنەوە بە ئەنقەست.

ب- ئەمما جۆری دووەم: ئەوانی ترن کە باس دەکرێن، ئەوانەن کە زانایان و شەرعناسان رایان تێیاندا جیاوازە. وەکو بەکارهێنانی کل و ماکیاج و قەترەی چاوو گوێ و هۆقنەو شاف و سپرای دەم و مەعجونی دان و.. هتد

٣- ئەوانەی رۆژوو بەتاڵ دەکەنەوە دوو پۆلن:

١ـ ئەوی رۆژوو بەتاڵ دەکەنەودو بەڵام گرتنەودیان بەسە.

٢ـ ئەوی رۆژوو بەتاڵ دەکەنەود کە هەم گرتنەودیان دەوێت، هەم کەفارەت.

## پۆلی یەکەم: ئەوی تەنها گرتنەوەی دەوێت

١و٢- **خواردن و خواردنەوە بە ئەنقەست**: ئەمە بەڵگەنەویستە، چونکە هەر کەس بە ئەنقەست خواردی یان خواردیەوە، یان جیماعی کرد، رۆژووەکەی خۆی بە ئەنقەست دەشکێنێت. ئەمما ئەگەر کەسێك بیری چوو بۆوە کە بەرۆژووە، یان لێی تێك چوو، یان بەزۆر خواردنێك یان خواردنەوەیەکیان کرد بە دەمیدا، رۆژووەکەی ناشکێت، کە نە لەسەرێتی بیگرێتەوە، نە کەفارەتیشی دەدات..

ئەبو هورەیرە ـ خوا لێی رازی بێت ـ گێڕایەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مَنْ نَسِيَ، وهو صائم، فَأَكَلَ أو شَرِبَ، فليُتِمَّ صومَه؛ فإنما أطْعَمَهُ اللّهُ وسَقَاهُ)[١] رواه الجماعة واتە: هەر کەس خواردی یان خواردیەوە ـ لە کاتێکدا کە بیری چوو بۆوە کە بەرۆژووە ـ با رۆژوودکەی تەواو کات، ئەوی خواردوێتی، یان خواردوێتیەوە ئەود خوای گەورد تێری کردووەو تینوێتییەکەی بۆ شکاندووە.

ئیمامی ترمذی دەفەرموێ: زۆرینەی ئەهلی عیلم وەکو سوفیانی سەوری و شافیعی و ئەحمەدو ئیسحاق کار بەم حەدیسە دەکەن.

---

[١] البخاري: كتاب الصيام – باب الصائم إذا أكل أو شرب ناسياً (٣ / ٤٠)، ومسلم: كتاب الصيام – باب أكل الناسي وشربه وجماعه لا يفطر، برقم (١١٧١) (٢ / ٨٠٩)، والترمذي: كتاب الصيام – باب ما جاء في الصائم يأكل، أو يشرب ناسياً، برقم (٧٢١) وقال: حديث حسن صحيح (٣ / ٩١)، وأحمد في "المسند" (٢ / ٣٩٥)، وابن ماجه: كتاب الصيام - باب ما جاء فيمن أفطر ناسياً، برقم (١٦٧٣) (١ / ٥٣٥)، وأبو داود بنحوه: كتاب الصوم – باب من أكل ناسياً، برقم (٢٣٩٨) (٢ / ٧٨٩، ٧٩٠)، وصحيح ابن خزيمة: كتاب الصوم – باب ذكر البيان أنَّ الآكل والشارب ناسياً لصيامه غير مفطر بالأكل والشرب، برقم (١٩٨٩) (٣ / ٢٣٨).

هەروا لە ئەبو هورەیرەوە -خوا لێی رازی بێت- دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مَنْ أكَلَ في شهرِ رمضانَ ناسِياً، فَلا قضاءَ عليهِ، ولا كفارةَ. رواه الدارقطني والبيهقي و الحاكم. وقال: صحيح على شرط مسلم [1]. واتە: هەر کەس لە ڕەمەزانـدا بە نائاگایی ڕۆژوو بشکێنێت، نە گرتنەوەی لەسەرەو نە کەفارەتیش.

ئیبن عەبباس خوا لێیان رازی بێت گێڕایەوە، کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (إنَّ اللّهَ وَضعَ عنْ أمَّتي الخطأ، والنسيانَ ومَا اسْتُكْرِهُوا عليهِ) [2] رواه ابن ماجة والطبراني والحاكم . واتە: خوای گەورە لە ئومەتەکەم ناگرێت بە هۆی هەڵەو بیرچوونەوەو ناچار کرانیان.

٣- **ڕشانەوە بە ئەنقەست:** هەر کەس بە ئەنقەست خۆی بڕشێنێتەوە، ڕۆژووەکەی هەر بە ڕشانەوەکەی دەشکێت، ئەمما ئەوی بە ئەنقەست نییە، نەگرتنەوەی لەسەرە نە کەفارەت.

ئەبو هورەیرە -خوا لێی رازی بێت- دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مَنْ ذَرَعهُا القَيءُ، فَلَيسَ عليهِ قَضَاءٌ، وَمَنْ اسْتَقَاءَ عَمْداً، فَلْيَقْضِ. رواه أحمد، وأبو داود، والترمذي وابن ماجه، وابن حبان، والدارقطني، والحاكم وصححه. واتە: هەر کەس ڕشانەوەکەی بەسەردا زاڵ بوو (یەعنی خۆی پێ نەگیراو هات) گرتنەوەی لەسەر

[1] ئیمامی ئیبنو حەجەر لە فتح الباریدا: كتاب الصوم / باب اذا أكل أو شرب ناسيا دا دەفەرموێ: اسناده وإن كان ضعيفا لكنه صالح للمتابعة فاقل درجات الحديث بهذه الزيادة ان يكون حسنا فيصلح للاحتجاج في كثير من المسائل بما هو دونه من القوة ويعتضد بانه قد أفتى به جماعة من الصحابة من غير مخالفة لهم منهم ڕیوایەتێکی تری حەدیسەکە دەفەرموێ: (من أفطر في شهر رمضانَ ناسِياً، فَلا قضاءَ عليهِ، ولا كفارةَ) ئەمیان شێخی ئەلبانی ڕەحمەتی دەربارەی دەفەرموێ: (أخرجه ابن حبان والحاكم وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وأخرجه الدارقطني والبيهقي وقالا: كلهم ثقات، قلت: (شێخی ئەلبانی دەفەرموێ قلت): وإسناده حسن.

[2] ابن ماجه: كتاب الطلاق، باب طلاق المكره والناسي،برقم (٢٠٤٥) (١ / ٦٥٩).

نییە، ئەمما ئەوی وا دەكات بڕشێتەوە (وەكو ئەوەی پەنجە بكات بە قورگی خۆیدا، یان بۆگەنێكی ناخۆش لە لووتی خۆی نزیك كاتەوە، یان خۆی بخاتە ناو بۆگەنێكی واوە كە هێڵنجی پێ بدات) ئەوە دەبێت بیگرێتەوە..

خەتتابی دەفەرموێ: نەمبیستووە شەرعناسان لەسەر ئەوە را جوێ بن، كە هەركەس ڕشانەوە تینی بۆ هێناو ڕشایەوە كەفارەتی لەسەر بێت. بەڵام ئەوی بە ئەنقەست خۆ دەرشێنێتەوە، دەبێت بیگرێتەوە. شێخی ئال بەسسام دەفەرموێ: كۆڕای زانایان لەسەر ئەمەیە.

ئەمە بەڵگەشە لەسەر ئەوەی، كە هەر كەس بە زۆر وای لێ بكەن بڕشێتەوەو رۆژووی پێ بشكێنن، رۆژووەكەی ناشكێت، چونكە بە سەربەستی خۆی نەرشاوەتەوە..

٤و٥- **حەیزو نیفاس:** هەردووكیان لەهەر ساتێكی رۆژدا دیاریان دا ـ با چەند دەقیقەیەك پێش بەربانگیش بێت ـ رۆژوو بەتاڵ دەكەنەوە. ئەمەش كۆڕای هەموو زاناو شارعناسانە.

٦- **ئاو هێنانەوەو خۆ رەحەت كردن:** چ بە دەستبازی لەگەڵ هاوسەر، چ بە لێخشانی ئامێری نێرو مێ، یان مێ و مێ، یان نێرو نێر، یان نێرو گیانلەبەر یان شتی تر، چ بە دەستپەڕ (**ئیستیمناء**)بە هەر شێوازێك بكرێت، رۆژووەكە بەتاڵ دەبێتەوە و گرتنەوەشی فەرزە.

بەڵام ئەگەر لە ئەنجامی نەزەركردن و بیر لێ كردنەوە هاتبێتەوە، بێ ئەوەی خۆی بە جۆرێك لە لێك خشاندن تێیدا بەشدار بوو بێت، رۆژووەكە بەتاڵ ناكاتەوە. چونكە وەكو خەون دیتنی رۆژ وایە تەنها غوسڵی لەسەرە.

بێگومان مەزی و وەدی: ئەو ئاوە لینجانەی لە دوای میز كردن یان بیر كردنەوە، دێنە دەردەوە نە رۆژوو دەشكێنن، و نە غوسڵیش دەخەنە سەر خاوەنیان.

٧- **خواردنی شتێك كه هی خواردن نییه:** خواردنی شتێك كه له حاڵەتی ئاساییدا هی ئەوە نییه كه كەسێك لە رێی دەمیەوە بیخوات. وەكوخواردنی نیو كیلۆ خوێ بە رووتی! ئەمانە هەر چەندە رێژەی رودانیان ئەگەر ئەستەم نەبێت زۆر دەگمەنە بەڵام ئەگەر شتێكی وا روویدا، رۆژووی پێ دەشكێت. شەرعناسان لەسەر ئەم حوكمە رێكن.

## گومانی بەربانگ و بەیانی

ئەگەر وای گومان برد كه بەربانگە، یان هێشتا شەوە، ئیتر هەر خواردی، یان خواردیەوە، یان جیماعی كرد، دوایی بۆی دەركەوت بەربانگ نەبووە، یان سپێدەی داوە، ئەوە رۆژووەكەی شكاودو حەتمەن دوایی دەبێت بیگرێتەوە. ئەمەش فەتوای هەر چوار مەزهەبەكەی ئەهلی سوننەتە، بەڵام چەند ئیمامێكی بەرێزی وەك ئیسحاق و داوود و ئیبنو حەزم و عەتاو و عوروەو حەسەنی بەسری و موجاهید دەفەرموون: رۆژووەكەی سەلامەتەو و گرتنەوەشی لەسەر نییە. چونكە خوای گەورە دەفەرموێ: (**وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُم بِهِ وَلَكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ**) واتە: لەو شتانەدا، كە بە هەڵە دەكەونە ناوی، گوناحتان ناگاتێ، بەڵكو لەوانەدا گوناهبار دەبن، كە بە ئەنقەست و لە ویستی دڵتانەوە كردووتانە. پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: (**إنَّ اللّهَ وَضَعَ عَنْ أمَّتي الخَطَأ**)[1] ، واتە: خوای گەورە لەو گوناحانەی ئوممەتەكەم دەبورێ، كە بە هەڵە دەیكەن.

عبدالرزاق له مەعمەرەوە ئەویش لە ئەعمەشەوە دەگێڕنەوە كه زەیدی كوڕی وەهەب فەرمووی: (**أفْطَرَ النَّاسُ في زَمَنِ عُمَرَ بنِ الخَطَّاب، فَرَأيْتُ عِسَاسَاً أُخْرِجَتْ مِنْ بيتِ حَفْصةَ، فَشَرِبُوا، ثُمَّ طَلَعَتْ الشَّمْسُ مِنْ سَحَابٍ، فَكَأَنَّ ذلكَ شَقَّ عَلى النَّاسِ، فقالوا: نَقضي هذا اليومَ، فقالَ عُمَرُ: لِمَ؟ واللّهِ، ما تجانَفْنَا**

[1] پێشتر سەرچاوەكانیمان لە (١١٣) دا هێنایەوە.

لإثْمَ)[١]، واته: لەزەمانی عومەری کوڕی خەتتابدا خەڵكێك ڕۆژووەکەیان شکاند، بینیم کیتەڵەیەکیان لە ماڵی خاتوو حەفسە هێنایە دەرێ و ئاویان لێ خواردەوە، پاشان خۆر لە هەورەوە هەڵهات، خەڵکەکە پێی ناڕەحەت بوون، ووتیان تازە ئەمڕۆمان کەوتۆتە سەرو دەبێت بیگرینەوە.

عومەر فەرمووی: بۆچی؟ ! خۆ بە خوا حەزمان لە تاوانو سەرپێچی نەکردووە.

ئیمامی بوخاری لە ئەسمائی کچی ئەبو بەکری سددیقەوە -خوا لێی ڕازی بێت- گێڕاویتیەوە، کە فەرموویەتی: (أفطَرْنا يَوماً مِنْ رمضانَ في غَيمٍ، على عَهْدِ رسولِ اللّه ﷺ، ثُمَّ طَلَعَتْ الشَّمْسُ)[٢] واتە: لە زەمانی پێغەمبەردا ﷺ لە ڕۆژێکی هەوردا، ڕۆژووەکەمان شکاند ـ دواییش خۆر دەرکەوت.

**ئیبنو تەیمیە ـ رحمه الله ـ دەفەرموێ: ئەمە بەڵگەیە بۆ دوو شت:**

١ـ لە ڕۆژی هەوردا باش نییە چاوەڕوان بکرێت، تا دڵنیا دەبن لە ئاوا بوونی خۆر. چونکە دەبینیت ئەوان هێندە ڕانەوەستان، تا دڵنیا دەبن، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی ئەوەی پێ نەدان، یاوەرانیش ـ کە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بوون ﷺ ـ لە نەوەکانی دوای خۆیان شارەزا ترو سوورترن لەسەر دینداری و تەقواو پابەندی.

٢ـ گرتنەوەی ئەو ڕۆژە پێویست نەبووە، ئەگەر پێویست بوایە پێغەمبەری مەزن ﷺ فەرمانی گرتنەوەی پێ دەکردن، ئەگەر فەرمانیشی پێ کردنایە حەتمەن ئەوەندەی ڕۆژوو شکاندنەکەشیان ئاشکراو زانراو دەبوو، وا دەبوو کە یاوەران بیزانن و بۆ تابعین و نەوەکانی دوای خۆیانی نەقڵ کەن.

---

[١] مصنف عبد الرزاق: كتاب الصيام – باب الإفطار في يوم مُغيم، برقم (٧٣٩٥)(١٧٩/٤).

[٢] البخاري: كتاب الصوم – باب إذا أفطر في رمضان، ثم طلعت الشمس (٤٧/٣) وابن ماجه: كتاب الصيام – باب ما جاء فيمن أفطر ناسياً برقم (١٦٧٤) (٥٣٥/١) وأبو داو د: كتاب الصوم – باب الفطر قبل غروب الشمس برقم (٢٣٥٩) (٢ / ٧٦٥)(ونسبه المنذري للترمذي أيضاً، وأحمد في "المسند" (٦ / ٣٤٦) والموطأ: كتاب الصيام - باب ما جاء في قضاء رمضان والكفارات برقم (٤٤) (١ / ٣٠٣)

**ئەم بۆچوونەی ئیمامی ئیبنو تەیمییەی رەحمەتی، هەرچەندە پێچەوانەی رای هـەر چـوار مەزهەبـە ناسـراوەکەی ئـەهلی سـوننەتە بـەڵام بەڵگەکـەی بەهێزترە بۆیە ئەم لەم مەسەلەیەدا شایانترە پەیڕەوی بکرێت.**

## پۆلی دووەم: ئەوی رۆژووەکە بەتاڵ دەکاتەوەو گرتنەوەو کەفارەتیشی دێتە سەر

هەر جیماع کردنە. کە بریتییە لە دیار نەمانی گۆپکەی زەکـەری پیاوەکـە لـە فەرجێکدا، پێشەوە بێت یان پاشەوە، پێش یان پاشی مرۆڤ بێت یـان گیانلەبـەرانی تر، رۆژووی هەردووکیانی پێ دەشکێت، مەگـەر یـەکێکیان ناچـار کـرا بێـت کـە بیکات، ئەو کاتە هی ئەویان ناشکێت.. ئەمەش رای جمهوری شەرعناسانە.

### کەفارەتی جیماع

جیماع: لێرەدا مەبەست لە ئەنجامدانی کاری وایە لە رەمەزاندا.

ئەبو هورەیرە ـ خوا لێی رازی بێت ـ دەگێڕێتەوە، کە کابرایەك (کە سەلەمەی کوڕی سـەخر بوو) هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ووتی: (**هَلَكْتُ يا رسولَ اللّهِ. قالَ: ومَا أهْلَكَكَ؟ قالَ: وقَعْتُ علَى امْرَأتي في رمضانَ. فقالَ: هلْ تجدَ ما تَعْتَقُ رقبةً؟ قالَ: لا. قالَ: فَهَلْ تَسْتَطيعُ أنْ تَصومَ شهرينِ مُتَتَابِعَينِ؟ قالَ: لا. قالَ: فَهَلْ تَجِدُ ما تُطْعِمُ سِتِّينَ مِسْكِيناً؟ قالَ: لا. قالَ: ثُمَّ جلَسَ، فأُتِيَ النَّبيَّ ﷺ بعَرَقٍ فيه تَمْرٌ، فقالَ: تصدّقْ بهذا. قالَ: فَهَلْ على أفْقَرَ منّا؟ فما بين لابتيها أهلُ بَيْتٍ أحوجُ إليه مِنّا. فَضَحِكَ النَّبيُّ ﷺ، حتَّى بَدَتْ نواجِذُهُ، وقالَ: اذهَبْ،**

**فأطعمْهُ أهلَكَ)**[١] رواه الجماعة. واتە: ئەی پێغەمبەری خوا فەوتام! فەرمووی: چی فەوتاندووتی؟ ووتی: لە رەمەزاندا جیماعم لەگەڵ خێزانم کردووە.

فەرمووی: توانات هەیە کۆیلەیەك ئازاد کەیت؟ ووتی: نەخێر.

فەرمووی: ئەدی دەتوانیت دوو مانگ لەسەر یەك بەرۆژوو بیت؟ ووتی: نەخێر.

فەرمووی: ئەدی دەتوانیت خواردنی شەست هەژاران بدەیت؟

ووتی: نەخێر. پاشان دانیشت، پاش کەمێك قوڵینەیەك خورمایان هێنا (زەمبیلەیەك، کە ١٥-٢٠ یَاعی گرتووە) فەرمووی بڕۆ ئەمە بکە بە خێرو ببەخشەرەوە.

ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەسەر هەژارتر لە خۆماندا؟! بە خوا قەسەم لە دەشتو کەناری ئەم شاردەدا لە ئێمە موحتاجتری لێ نییە پێویستی پێی بێت! پێغەمبەر ﷺ هێندە پێکەنی تا خرێکانی دەرکەوتن.. ئینجا فەرمووی: بڕۆ بیدە بە ماڵ و منداڵی خۆت..

ئەم حەدیسە بۆتە بەڵگەی ئەو کەسانەی، کە دەڵێن کەفارەت بە نەداری و دەست کورتی، لە کۆڵ نابێتەوە. ئەمەش یەکێکە لە راکانی ئیمامی شافیعی و رای بەناوبانگی ئیمام ئەحمەد. بەڵام هەندێك لە مالیکییەکان زانای تریش دەفەرموون: کەفارەت بە نەداری لە کۆڵ دەبێتەوە، راستتریش بۆچوونەکەی ئیمامی شافیعیو ئەحمەدە، چونکە لە حەدیسەکەدا دەردەکەوێت، کە کابرا هەرچەند روونی دەکردەوە، کە نەدارە پێغەمبەر ﷺ کەفارەتەکەی لەسەر لا نەبرد..

---

[١] البخاري: كتاب الصوم – باب إذا جامع في رمضان... (٣ / ٤١، ٤٢)، ومسلم: كتاب الصيام – باب تغليظ تحريم الجماع في نهار رمضان على الصائم برقم (٨١) (٢ / ٧٨١) والترمذي: كتاب الصوم – باب ما جاء في كفارة الفطر في رمضان برقم (٧٢٤) (٣ / ٩٣) وقال: حديث حسن صحيح وأبو داود: كتاب الصوم – باب كفارة من أتى أهله في رمضان برقم (٢٣٩٠) (٢ / ٧٨٣) وابن ماجه: كتاب الصوم – باب كفارة من أفطر يوماً من رمضان، برقم (١٦٧١) (١ / ٥٣٤) ونسبه المنذري للنسائي أيضاً.

مەزهەبی جمهور (سێ لە چوار مەزهەبەکە) ئەوەیە کە ژن وپیاو، مادام هەردووکیان رۆژووەوان بوو بن و بە وویست و ئیرادەی هاوبەشیان ولەرۆژی رەمەزانداو، بە ئەنقەست جیماعەکەیان کرد بێت؛ لە کەفارەت دانەکەدا وەکو یەك دەبن، واتە کەفارەت دەکەوێتە سەر هەردووکیان. نەك سەر یەکێکیان.

ئەمما ئەگەر پیاوە، ژنەی ناچار کرد بوو، یان ژنە بە هۆی عوزرێکەوە بەرۆژوو نەبوو؛ ئەوە هەر پیاوەکە کەفارەتەکە دەدات..

مەزهەبی شافیعی دەفەرموێ: کەفاردت لەسەر ژنەکە هەر نییە، نە لە حاڵەتی ناچار کردنیدا، نە لە حاڵەتی سەرپشك (موخەییەر) یدا، تەنها رۆژوو گرتنەوەکەی خۆی لەسەر دەبێت و بەس.

ئیمامی نەوەوی ـ رەحمەتی خوای لێ بێت ـ دەفەرموێ: بە شێوەیەکی گشتی کابرا هەر دەبێت کەفارەتێکی تایبەتی لە جیاتی نەفسی خۆی بدات. ژنەش هیچی لەسەر نییە، چونکە کەفارەتەکە باجێکی دارایی تایبەت بە جیماعەکەیە، وەکو مارەییەو کەوتۆتە سەر پیاوەکە.

ئەبو داوود ـ رەحمەتی خوای لێ بیت ـ دەفەرموێ: لە ئیمامی ئەحمەدی رەحمەتییان پرسی: کابرایەك لە رۆژی رەمەزاندا بچێتە لای ژنەکەی، ژنە دەبێت کەفارەت بدات؟ فەرمووی: نەمزانیووە کەفارەتی بکەوێتە سەر. (ئەمەش یەکێکە لەو دوو ریوایەتەی لەوەوە گێڕراوەتەوە).

ئیبنو قودامەش ـ رەحمەتی خوای لێ بێت ـ دەفەرموێ: ئەوە لەبەر ئەو حەدیسەیە (مەبەست لە کابرای هەژارە، کە لەسەرەوە باسەکەیان هێنایەوە) کە پێغەمبەر ﷺ لە سەردەمی خۆیدا فەرمانی بە کابرا کرد، کە کۆیلەیەك رزگار کات، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، کە دەیزانی جیماعەکە لە هەردووکیانەوە بووە، بەڵام هیچ فەرمانێکی نەدا بەسەر ژنەکەدا [1].

---

[1] مسلم: كتاب الصيام - باب تغليظ تحريم الجماع في نهار رمضان على الصائم برقم (٨٣، ٨٤) (٢ / ٧٨٢) وأبو داود بمعناه: كتاب الطلاق – باب في الظهار، برقم (٢٢٢١، ٢٢٢٢) (٢ / ٦٦٦) والمغني، والشرح الكبير، لابن قدامة (٣ / ٥٨) وموفق الدين وشمس الدين المقدسيان (طبعة دار الكتاب العربي – بيروت لبنان ١٤٠٣ هـ – ١٩٨٣ م).

ئەگەر ژنە پیاوەکەی ناچار کرد، کەفارەتەکە دەکەوێتە سەر ژنەکە.

کەفارەتیش لەسەر رای زۆرینەی زانایان هەر بەو تەرتیب و ریزبەندییەیە کە پێغەمبەر ﷺ لە حەدیسەکەدا بە ریز فەرموویەتی. واتە: یەکەمجار ئازاد کردنی کۆیلە، ئەگەر نەیتوانی، ئینجا بەرۆژوو بوونی دوو مانگ لەسەر یەك، ئەگەر نەیتوانی، ئینجا خواردنی شەست هەژارو دەست کورت لە ژەمە خواردنی مام ناوەندی ماڵەکەی خۆی. چونکە جائیز نییە لە کەفارەتێکیانەوە باز دا بۆ یەکێکی تری سووك تر. ئیللا مەگەر توانای نەبوو. ئەگەرچی هەندێك لە مالیکییەکان و رایەکی ئیمام ئەحمەدیش هەیە کە دەفەرموون: کابرا سەرپشك (موخەییەر) ەو هەر کامیانی هەڵبژارد، بۆی هەیەو کەفارەتەکەی لە کۆڵ دەکەوێت. چونکە ئیمامی مالیك و ئیبنو جورەیج لە حەمیدی کورِ ی عبد الرحمن و ئەویش لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرِێتەوە کە: (أنَّ رجُلاً أفْطَرَ في رمضانَ، فأمَرَهُ رسُولُ اللّه ﷺ أنْ يكَفِّر بعِتْقِ رقَبَةٍ، أو صيامِ شهرينِ متتابعَينِ أو إطعامِ ستينَ مسْكيناً)[1] رواه مسلم واتە: کابرایەك لە رەمەزاندا رۆژووی شکاند، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێدا، لە کەفارەتیدا کۆیلەیەك ئازاد بکات، یان دوو مانگ لەسەر یەك بەرۆژوو بێتیان خواردنی شەست هەژار بدات. ئاشکرایە ووشەی (أو: یان) کە لە حەدیسەکەدا هاتووە بۆ سەرپشك بوونە. کەفارەتەکە بە هۆی سەرپێچییەکەوەیە، بۆیە وا بە شێوازی سەرپشك کردن هاتووە. ئەمەش وەکو کەفارەتی سوێند وایە..

حەنەفییەکان و رایەکی ئیمام ئەحمەدیش دەفەرموون: ئەگەر کابرایەك لە رۆژی رەمەزانداو بە رۆژ جیماعی لەگەڵ ژنی خۆی کرد، بۆ سبەینێ پێش ئەوەی کەفارەتەکەی دابێت، دیسان جیماعێکی تری کرد، هەر یەك کەفارەت دەدات، چەنکە هەر دوو کەفارەتەکە نێك ئالان.. بەلام مەزهەبی مالیکی وشافیعی و

[1] مسلم: كتاب الصيام – باب تغليظ تحريم الجماع في نهار رمضان على الصائم، ووجوب الكفارة الكبرى فيه وبيانها، برقم (٨٤) (٢ / ٧٨٢، ٧٨٣).

ریوایەتی دووەمی ئیمام ئەحمەد ئەوەیە کە دوو کەفارەتی دەکەوێتە سەر، چونکە هەر کەفارەتە هی رۆژە خواپەرستییەکی سەربەخۆیە. ئەمە وەکو حوکمی رۆژووی دوو رەمەزانە کە بگەنەوە بەیەك

زاناو شەرعناسان لەسەر ئەوە رێکن کە هەر کەس لە رۆژی رەمەزاندا جیماعی کرد و کەفارەتەکەی دا، پاشان لە رۆژێکی تریشدا دیسان جیماعی کرد دەبێت کەفارەتێکی تر بدات.

هەروەها لەسەر ئەوەش رێکن کە هەر کەسێك لە رۆژی رەمەزاندا جیماعی کرد و پێش ئەوەی کەفارەتەکەی بدات، هەر لە هەمان رۆژدا جارێکی تریش جیماعی کردەوە، هەر یەك کەفارەتی دەکەوێتە سەر.. تەنها ئیمام ئەحمەد نەبێت کە دەفەرموێ: دەبێت کەفارەت بۆ جیماعی دووەمیش بدات.

## رۆژوو گێڕانەوە (قەرزی رەمەزان)

قەرز دانەوەو گرتنەوەو پێ بوونەوەی رۆژوو، هەموو هەر بەمانای بەڕۆژوو بوونەوەیە لە جیاتی رۆژووی ئەو رۆژانەی رەمەزانە کە تێدا نەگیراوە.

قەرزی رەمەزان مەرج نییە دەست بە جێ دوای رەمەزانەکە بدرێتەوە. چونکە بواری گرتنەوەی وا لە هەموو یازدە مانگەکەی دواییدا. هەروەها کەفارەت دانەکەشی. چونکە وەکو ئیمامی بوخاری و موسلیمی رەحمەتی گێڕاویانەتەوە، دایکە عائیشە ـ خوا لێی رازی بێت ـ کە قەرزاری رەمەزان ببوایە ـ هەر چەندە دەشیتوانی ـ بەڵام دەست بەجێ نەیدەگرتەوە، بەڵکو دەیخستە مانگی شەعبان [1].

گرتنەوەی رۆژووی قەرز مەرج نییە چەند رۆژ خوراوە ئەوەندە رۆژ لەسەر یەك لە جیاتیان بگیرێتەوە، نا، دەتوانرێت چەندەها رۆژیان نێوان خرێت. بۆ نموونە

---

[1] مسلم: كتاب الصيام – باب قضاء رمضان في شعبان برقم (١٥١، ١٥٢) (٢ / ٨٠٢، ٨٠٣) والفتح الرباني برقم (١٧٩، ١٨٠) (١٠ / ١٢٦، ١٢٧) وانظر المسألة بالتفصيل في: تمام المنة (٤٢١)

کەسێك چوار رۆژی رەمەزان قەرزارە، بۆی هەیە لە شەووالدا رۆژێك و لە موحەڕەم رۆژێك و لە رەجەب رۆژێك و لە شەعبانی پێش رەمەزانی نوێ رۆژی چوارەم بگرێتەوە هەر وەکو کە بۆی هەیە هەر چوار رۆژەکە لە هەر مانگێکیاندا بێت لەسەر یەك بگرێتەوە. چونکە خوای گەورە کە فەرموویەتی: (فَمَن كَانَ مِنْكُم مَّرِيضاً أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ) ٢ البقرە/ ١٨٤ واتە: ئەو کەسەی کە نەخۆش بوو، یان لەسەفەردا بوو با بەقەدەر رۆژە خوراوەکانی لە رۆژانی دوایی تردا بیگرێتەوە.. ئاماژەی ئەوەی تێدا نییە کە گرتنەوەیان دەبێت لەسەر یەك بن یان لێك جوداو دوور.

الدار قطني لە ئیبنو عومەرەوە ـ خوا لێیان رازی بێت ـ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی گرتنەوەی قەرزی رەمەزان فەرموویەتی: (إِنْ شاءَ فَرَّقَ، وإِنْ شاءَ تابَعَ)[1] واتە: ئەوی حەز دەکات لێك جوداو دوور بیانگرێتەوە بۆی هەیە، ئەوی دەشیەوێت یەك لەسەر یەك بیانگرێتەوە هەر بۆی هەیە.

ئەگەر ئەم قەرزەی رەمەزانی هەر نەدایەوە تا رەمەزانی ساڵی نوێی بەسەردا هاتەوە، رەمەزانەکەی ئەمساڵی ئاسایی دەگرێت ودوای رەمەزان قەرزەکەی پاری دەداتەوە، حەنەفییەکان و شێخ حەسەنی بەسری دەفەرموون هیچی کەفارەت لەسەر نابێت، ئیتر بە ئەنقەست لە رەمەزانەکەدابەڕۆژوو نەبوو بێت یان عوزری هەبوو بێت، هەروەها عوزری هەبوو بێت کە بە درێژایی یازدە مانگەکەی دوایی نەیگرتۆتەوە یان لەویشدا هەر نەیبوو بێت، چوون یەکن.. بەڵام ئیمامەکانی تر: مالیك و شافیعی و ئەحمەدو ئیسحاق و هەندێك هەر لە حەنەفییەکاندەفەرموون، ئەگەر عوزری هەبوو بێت، کەفارەت نادات، دەنا دەبێت بیشیگرێتەوەو کەفاردتیشی بدات.. **ئەم رایەش لای زۆرینەی زانایان پەسەندترە.**

[1] الدارقطني: كتاب الصيام – باب القبلة للصائم برقم (٧٤ ((٢/١٩٣) وقال: لم يسنده غير سفيان بن بشر، وقد صحح الحديث ابن الجوزي، وقال: ما علمنا أحداً طعن في سفيان بن بشر، والحديث ضعيف، انظر: تمام المنة (٤٢٣)

کەفارەتی هەر رۆژێکیشی یەك (موود: ٧٥٠ گرام) ە لە گەنم، نارد، جۆ، خورما، یان لە زەمانی ئێستای ئێمەدا ژەمێکی مام ناوەندی چێشتخانەی بازاڕە یان دوو شیش کەباب یان لەفەیەکی ماکدۆناڵد بۆ ئەوانەی لە رۆژئاوا دەژین..

## مردووی قەرزاری رەمەزان

دەبێت قەرزی مردووی قەرزار بدرێتەوە، جا قەرزی خوای گەورە بێت، یان قەرزی خەڵکی.. زاناو شەرعناسان لەسەر ئەوە کۆن، کە هەر کەس مرد بێت و قەرزی نوێژی لەسەر بێت، کەس لە خزم و بێگانەیبۆیان نییە بۆی بدەنەوە. واتە لە جیاتی ئەو نوێژەکان بکەنەوە. هەروەها لەسەر ئەوەش یەك دەنگن، کە ئەگەر کەسێکی زیندوو نەیتوانی بەڕۆژوو بێت، کەس لە خزم و بێگانە ناتوانن لە جیاتی ئەو بەڕۆژوو بن.

بەڵام ئەگەر مردوو قەرزاری رۆژوو بوو، ناکۆکی لەسەر ئەوە هەیە:

### ـ ئەگەر ئەو کاتەی خۆی لە ژیاندا مابوو، دەیتوانی بەڕۆژوو بێت ئەوە:

جمهوری پێشەوایان ئیمامی ئەبو حەنیفەو مالیك و رای زانراوی ئیمامی شافیعی لەسەر ئەوەیە، کە لەجیاتی ئەو بەڕۆژوو نابنەوە، بەڵام لە جێی هەر رۆژێکی قەرزەکەی، (موود) ێك خۆراك کەفارەت دەدەن. ئیمامی ئەبو حەنیفە دەفەرموێ: نیو ساع (سێ چارەکی پەرداخێك) گەنم، یان ساعێك لە دانەوێڵەی تر. (٦٢٥ گرام لە گەنم یا نارد، یا خورما یان هەر ژەمێك خۆراکی مام ناوەندی ناوچەکە.. ).

مەزهەبی شافیعی دەفەرموێ: باشترە واریسەکان (میراتگران)ی کابرا، یان سەرپەرشتیار (وەلی)یەکانی رۆژەکانی بۆ بگرنەوە ـ بێگومان مەبەست لە رۆژووی فەرزە چ رەمەزان بێت چ نەزر ـ ئینجا گەردنی ئازاد کەن و ئیتر کەفارەت پێویست ناکات.. ئەگەر بێگانەیەکیش بە ئیزنی سەرپەرشتیارەکانی بۆی گرتەوە،

هەر جائیزەو قەرزەکە لە کۆڵ مردووەکە دەبێتەوە.. دەشێت یەك کەس یان زیاتر ـ ژن بن یان پیاو ـ قەرزەکان بگرنە خۆو بۆی بگرنەوە، یەعنی مەرج نییە یەك کەس بیکات، مەرجیش نییە لەسەر رۆژەکان رێکەون، دەتوانن هەموو بڕیار بدەن لە رۆژێکی دیاری کراودا بۆی بگرنەوە، دەشتوانن دابەشی کەن بەسەر رۆژانی ساڵدا (بێ گومان جگە لە رەمەزانان کە خۆشیان دەبێت بۆ خۆیان بەرۆژوو بن) ئەمە هەمووی بۆ رۆژووی رەمەزان و نەزرە بەڵام بۆ دانەوەی قەرزی بابای مردوو لە کەفارەت، دەبێ یەك کەس یان زیاتر رۆژ لە دوای رۆژ بیگرنەوە ئیمامی ئەحمەد و بوخاری و موسلیم لە خاتوو عائیشەوە ـ خوا لێی رازی بێت ـ گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ ماتَ، وعليه صِيامٌ، صامَ عنهُ وليُّهُ)[١] واتە: هەر کەس مردو قەرزاری رۆژوو بوو، سەرپەرشتیارانی بۆی دەگرنەوە..

ئیمامی ئەحمەدو خاوەن سونەنەکان (ئەو ئیمامانەن کە کتێبێ حەدیسیان بە ناوی السنن نووسیوە)لە ئیبنو عەبباسەوە ـ خوا لێی رازی بێت ـ دەگێڕنەوە کە کابرایەك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و پرسی: (يا رسولَ اللّه، إنَّ أمِّي ماتَتْ، وعليها صِيامُ شَهْرٍ، أفأقْضيهِ عنها؟ فقالَ: لَو كانَ على أمِّكَ دَيْنٌ، أكُنْتَ قاضيهِ؟ قالَ: نَعَمْ. قال: فَدَيْنُ اللّهِ أحَقُّ أنْ يُقْضَى)[٢] واتە: دایکم کە مرد

---

[١] البخاري: كتاب الصوم – باب من مات وعليه صوم صامه عنه وليه(٣/٤٦،٤٥) ومسلم: كتاب الصيام – باب قضاء الصيام عن الميت، برقم (١٥٣) (٢ / ٨٠٣) وأبو داود: كتاب الصوم – باب فيمن مات وعليه صيام، برقم (٢٤٠٠) (٢ / ٧٩١، ٧٩٢)، وأحمد في "المسند" (٦ / ٦٩)، وكتاب الأيمان والنذور، باب ما جاء فيمن مات وعليه صيام صام عنه وليه برقم (٣٣١١) (٣ / ٦٠٦،٦٠٥)

[٢] البخاري: كتاب الصوم – باب من مات وعليه صوم (٢ / ٤٧) ومسلم: كتاب الصيام – باب قضاء الصيام عن الميت برقم (٨٠٤/٢) (١٥٥) وأبو داود: كتاب الأيمان والنذور – باب ما جاء فيمن مات وعليه صيام صام عنه وليه برقم (٣٣١٠) (٣ / ٦٠٥) والترمذي بلفظ "إن أختي ماتت": كتاب الصوم – باب ما جاء في الصوم عن الميت، برقم (٧١٦) (٣ / ٨٦)، وابن ماجه بلفظ: "إن أختي ماتت": كتاب الصيام – باب من مات وعليه صيام من نذر، برقم (١٧٥٨) (٥٥٩/١) وبلفظه مختصراً برقم (١٧٥٩) (١ / ٥٥٩) وأحمد في "المسند" (١ / ٢٢٧، ٢٥٨ بلفظه) (١ / ٢٧٩، ٣٤٥ بمعناه).

مانگێکی ڕەمەزان قەرزار بوو، ئایا بۆی بگرمەوە. فەرمووی: ئەگەر دایکت قەرزێکی لەسەر بوایە بۆت دەدایەوە؟ ووتی: بەڵێ. فەرمووی: دە قەرزی خوای گەورە حەقترە بدرێتەوە. ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ: ئەمە (کە دەبێت سەرپەرشتیارانی مردوو قەرزی رۆژووی بۆ بدەنەوە) راو بۆچوونی مامۆستایان و پێشەوایانی مەزهەبی ئێمەیە، ئەوانەی کە شارەزای حەدیس و شەرعن.. هەندێ لە ئیمامە بەرێزەکان ـ وەك ئیمامی ئەبو حەنیفە ـ دەفەرموون: هەر پێویست ناکات بۆی بدرێتەوە، هەندێکی تری وەك ئیمامی ئەحمەدو لیث و ئیسحاق و ئەبو عوبەیدو ئیبنول القەییم دەفەرموون: هەر رۆژووی نەزرەکانی بۆ دەدرێتەوە، چونکە خۆی بە خۆیەوەی بەستۆتەوە، لە دانەوەی رۆژووی نەزرەکەشدا ئەهلی حەدیس و ئیبنو حەزم و کۆمەڵێك لە فەرموودەوانانی مەزهەبی شافیعی دەفەرموون: تەنها ئەو نەزرانەی بۆ دەدرێتەوە کە لەسەرنی و لە ژیانیدا دەیتوانی بیانگرێتەوە بەڵام نەیگرتوونەتەوە.. کەچی ئیمامی ئیبنو تەیمییە دەفەرموێ هەر رۆژوویەك قەرزار بێت دەبێت بۆی بدرێتەوە، جا شەرع لەسەری فەرز کردبێت وەکو ڕەمەزان، یان خۆی لەسەر خۆی فەرز کردبێت وەکو نەزر.. وا دیارە بۆچوونەکەی ئیمامی ئیبنو تەیمییە لە هەموان چاکتر پێکابێتی چونکە دەقی حەدیسەکە رۆژوو بە شێوەیەکی رەهاو گشتی باس دەفەرموێ.. بە تایبەتی کە ئەو حەدیسانەی بەرامبەرەکانی کردوویانەتە بەڵگەی بۆچوونی خۆیان وەك ئەم حەدیسە نییە و ناتوانرێت ئەمیان پێ لاواز کرێن، بە پێچەوانەشەوە حەدیسی تریش هەیە کە پاڵپشتی ئەم حەدیسە دەکەن، بەڵام ئێمە لەبەر پێویست نەبوونی نەمانهێنانەوە..

## ڕۆژووی نائاسایی

وەکو ئەو شوێنانەی ڕۆژیان زۆر درێژە، یان زۆر کورتە.

زانایان لەم بارەوە را جوێن. هەیانە دەفەرموێ: ڕۆژوو نوێژیان بە گوێرەی کاتی ئەو ولاتانە دەبێت، کە شەریعەتی خوایان تێدا دارێژراوە، کە ماوەی شەوو ڕۆژیان وەکو یەکە. وەکو مەککەو مەدینە.. ئەمە فەتوای شێخی بن بازیشە ـ رحمه الله ـ

هەندێکی تریان دەفەرموون: بە گوێرەی کاتی نزیکترین ولات لێیانەوە دەکەن.

ئەمە حوکمی نوێژو ڕۆژووە لەو شوێنانەی، کە خۆریان لێوە هەلدێت و لێیانەوە ئاوا دەبێت، ئەما شوێنی وەکو پۆل (قطب)ەکانی باکورو باشووری زەوی، کە شەش مانگ شەوەو شەش مانگ ڕۆژە، ئەوانە کاتەکان تەقدیر دەکەن، وەکو ئەوەی ١٢ سەعات ئیعتیبار بکەن بە ڕۆژ و ١٢ سەعاتەکەی تر بکەنە شەو. نوێژو ڕۆژووەکانیان بەم تەقدیر کردنە حسێب دەکەن.. ئێستا موسولمانانی باکوری نەرویج و سوید و فنلەنداو کەنەدا ئاوا دەکەن.

## شەوی قەدر (ليلة القدر)

١ـ **گەورەیی ئەم شەوە:** ئەم شەوە گەورەترین و چاکترین شەوی هەموو سالەکەیە، چونکە خوای پەروەردگار لە مەتحیدا فەرموویەتی: (**إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ. وَمَا أَدْرَاكَ مَا لَيْلَةُ الْقَدْرِ. لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ**) ٩٧ القدر/١ـ٣ واتە: ئێمە ئەم قورئانەمان لە شەوی قەدردا ناردۆتە خوارەوە. تۆ چوزانیت شەوی قەدر چییە؟. شەوی قەدر لە هەزار مانگ باشترە. کەوا بووپاداشتی خواپەرستی (نوێژو زیکرو قورئان خوێندن و.. ) لەو شەوەدا باشترە لە پاداشتی خواپەرستی هەزار مانگی بێ لەیلەتولقەدر..

٢- **پاداشتی سوور بوون لەسەر شەونخوونیەکیەکەی:** خێرێکی گەورەیە کە موسوڵمان بایەخ بە دە شەوی ئەخیری ڕەمەزان بدات و سوور بێت لەسەر ئەوەی بزانێت کامیان شەوی قەدرە، تا بە خواپەرستی و زیکری خوای گەورەوە ڕۆژی تێدا بکاتەوە. چونکە پێغەمبەر ﷺ خۆی هەموو ڕەمەزانان، هەوڵی دەدا بزانێت قەدر بەر کام شەوەی دە شەوی ئەخیر کەوتووە تا بە خواپەرستی بیباتە سەر. هەر وەکو دایکە عائیشە ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ گێڕاوێتیەوەکە کە: (**أنَّ النبيَّ ﷺ: كانَ إذا دَخَلَ العَشْرُ الأواخِر، أحْصى الليلَ، وأيقَظَ أهْلَهُ، وشَدَّ المئزَرَ**)[1]. واتە: پێغەمبەر ﷺ کە دە ڕۆژی کۆتایی ڕەمەزان دادەهات، شەوانی (بەشەو نوێژ و پەرستن) زیندوو دەکردەوەو ماڵ و منداڵی بەخەبەر دێناو پەشتەماڵی لێ توند دەکردەوە (واتە خۆی گورج دەکردەوە تا خۆی بۆ خواپەرستی تەرخان کات)

٣- **کام شەوەیانە:** ڕای زانایان لە دیاری کردنی شەوی قەدردا جیاوازە، هەیانە دەفەرموێ: شەوی بیست و یەکەمی ڕەمەزانە، هەیانە دەفەرموێ: شەوی بیست و سێیەمە، یان: بیست و پێنجەمە، هەیانە دەفەرموێ: شەوی بیست و نۆیەمە، هی واشیان هەیە کە فەرموویەتی: شەوی قەدر جێگیر نییە چونکە هەر ساڵەو لە شەوێکی ئەو دە ڕۆژەی کۆتایی ڕەمەزانەکەدایە..

بەڵام زۆرینەی هەرە زۆری زانایان و شەرعناسان لەسەر ئەوەن کە شەوی قەدر شەوی بیست و حەوتەمی ڕەمەزانەو نەگۆڕە..

---

[1] البخاري: كتاب الصوم – باب فضل العمل في العشر الأواخر من رمضان (٣ / ٦١)، ومسلم: كتاب الاعتكاف – باب الاجتهاد في العشر الأواخر من شهر رمضان، برقم (٧) (٢ / ٨٣٢)، وابن ماجه: كتاب الصوم – باب في فضل العشر الأواخر من رمضان، برقم (١٧٦٨) (١ / ٥٦٢)، وأبو داود: كتاب الصلاة _ باب في قيام شهر رمضان، برقم (١٣٧٦) (٢ / ١٠٥)، والنسائي: كتاب قيام الليل وتطوع النهار – باب الاختلاف على عائشة في إحياء الليل، برقم (١٦٣٩) (٣ / ٢١٧، ٢١٨) وأحمد في "المسند" بألفاظ متقاربة (٦ / ٤٠، ٤١، ٦٦، ٦٨، ١٤٦).

ئیمامی ئەحمەد ـ بە سەنەدی سەحیحەوە ـ لە ئیبنو عومەرەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من كان مُتَحَرِّهَا، فَلْيتحرَّها ليلة السابع والعشرين)[1] واتە: ئەوی بۆی دەگەڕێ، با لە شەوی بیست و حەوتدا بێت..

ئیمامی موسلیم و ئەحمەدو ئەبو داوودو ترمذی و (بە سەحیحی داناوە) لە ئوبەیی کوڕی کەعبەوە ـ خوا لێی رازی بێت ـ گێڕاویانەتەوە کە فەرموویەتی (والله الذي لا إله إلا هو، إنها لفي رمضان – يحلف ما يستثني – ووالله، إني لأعلم أي ليلة هي، هي الليلة التي أمرنا رسول الله ﷺ بقيامها، هي ليلة سبع وعشرين، وأمارته، أن تطلع الشمس في صَبيحة يومها بيضاء، لا شُعاع لها)[2] واتە: بەو خوایە هیچ خوایەکی بە حەق جگە لەو نییە، شەوی قەدر لە رەمەزاندایەو سوێنیشم بە خوا دەزانم کام شەوەیە، ئەو شەوەیانە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی شەوخوونی بۆ خواپەرستی تێدا پێ دەکردین، کە شەوی بیست و حەوتەمە، نیشانەکانیشی ئەوەیە کە خۆری رۆژی دواتری خۆرەکەی کە هەڵدێت زۆر سپی و سافەو تیشکی (زەردی) نییە..

٤- **زیندوو کردنەوەی شەوی قەدر:** ـ ئیمامی بوخاری و موسلیم لە ئەبو هورەیرەوە ـ خوا لێی رازی بێت ـ گێڕاویانەتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من قام ليلة القدْرِ، إيماناً واحتساباً، غُفِرَ له ما تقدَّم مِنْ

---

[1] أحمد في "المسند" (٢ / ٢٧، ١٥٧).

[2] مسلم: كتاب الصيام – باب فضل ليلة القدر والحث على طلبها، وبيان محلها وأرجى أوقات طلبها، برقم (٢٢٠) (٢ / ٨٢٨)، وكتاب صلاة المسافرين وقصرها – باب الترغيب في قيام رمضان، وهو التراويح، برقم (١٧٩) (١ / ٥٢٥)، والترمذي: كتاب الصوم – باب ما جاء في ليلة القدر، برقم (٧٩٣) (٣ / ١٥١)، وقال أبو عيسى: هذا حديث حسن صحيح. وأبو داود: كتاب الصلاة _ باب في ليلة القدر، برقم (١٣٧٨) (٢ / ١٠٦، ١٠٧)، وأحمد في" المسند" (٥ / ١٣٠، ١٣١).

ذنبه )[1] واته: هەر کەسێك شەوی قەدر بە خواپەرستی و لەبەر خاتری خوا زیندوو کاتەوە، لە هەموو گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێت..

ـ ئیمامی ئەحمەدو ئیبنو ماجەو الترمذي (کە بە سەحیحی داناوە) لە دایکە عائیشەوە ـ خوا لێی رازی بێت ـ گێراویانەتەوە کە دەفەرموێ: (**قلت: يا رسول الله، أرأيت إن علمت أيُّ ليلةٍ ليْلةُ القدْرِ، ما أقول فيها؟ قال قولي: اللهم إنك عَفوٌّ تحبُّ العفو، فاعْفُ عني**)[2] واتە: ووتم: ئەی پێغەمبەر خوا، ئەرێ، ئەگەر زانیم شەوی قەدر کامیانە، چ دوعایەکی تێدا بکەم؟ فەرمووی: بڵێ: خوایە تۆ بەخشندەیت و حەزت لە بەخشندەییە، دە لێم خۆش بە..

## ئیعتیکاف

١ـ **مانای**: ئیعتیکاف بە مانای پابەند بوونو خوو گرتنە بە شتێکەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: (**ما هذه التماثيلُ التي انتم لها عاكِفونَ**) ٢١الأنبياء/٥٢ واتە: ئەم پەیکەرانە چییە وا ئێوە پێیانەوە پابەندن وبۆیان چوونەتە خەڵوەتەوە؟ یان: (**وَانظُرْ إِلَى إِلَهِكَ الَّذِي ظَلْتَ عَلَيْهِ عَاكِفًا**) طه/٩٧..

---

[1] البخاري: كتاب الصوم _ باب فضل ليلة القدر (٣ / ٥٩)، وباب من صام رمضان إيماناً واحتساباً ونية (٣ / ٣٣)، ومسلم: كتاب صلاة المسافرين وقصرها – باب الترغيب في قيام رمضان وهو التراويح، برقم (١٧٥، ١٧٦) (١ / ٥٢٤)، والنسائي: كتاب الصوم – باب ثواب من قام رمضان وصامه إيماناً واحتساباً، والاختلاف على الزهري في الخبر في ذلك، برقم (٢٢٠٢) (١٥٦/٤، ١٥٧)، وأبو داود: كتاب الصلاة _ باب في قيام شهر رمضان، برقم (١٣٧٢) (١٠٣/٢)، والترمذي: كتاب الصوم – باب ما جاء في فضل شهر رمضان، برقم (٦٨٣) (٥٨/٣)، وأحمد في "المسند" (٢ / ٣١٨، ٣٢١، ٣٤٧، ٤٠٨، ٤٢٣، ٤٧٣، ٥٠٣).

[2] الترمذي: كتاب الدعوات – باب حدثنا يوسف بن عيسى...، برقم (٣٥١٤) (٥ / ٥٣٤)، وقال أبو عيسى: هذا حديث حسن صحيح، وابن ماجه: كتاب الدعاء – باب الدعاء بالعفو والعافية، برقم (٣٨٥٠) (٢ / ١٢٦٥)، وأحمد في "المسند" (٦ / ١٧١، ١٨٢، ١٨٣، ٢٥٨).

لە زاراوەیـیشدا مەبەست لە پابەند بوون و مانەوەیە لەمزگەوتێکـدا بـە نیـازی خواپەرستی و نییەتی لە خوا نزیك بوونەوە.

٢- **شیاوێتی**: هەموو زانایان رایان وایـە، کـە ئیعتیکـاف سـوننەتە، چـونکە پێغەمبەر ﷺ (**کان النبي ﷺ یَعْتَکِفُ، في کُلِّ رمضانَ عَشَرَةَ أیَّامٍ، فلما کان العامُ الذي قُبِض فیه، اعْتَکَفَ عِشرینَ یوماً**)[١] رواه البخاري، وأبو داود، وابن ماجە، واتە: دە رۆژ لە هەموو رەمەزانێك ئیعتیکافی دەکرد. لەو ساڵەشـدا کـە کۆچی دوایی تێدا کرد، بیست رۆژی رەمەزانەکەی ئیعتیکافی کـرد. یـاوەران و خێزانە بەڕێزەکانی و ئەوانەی لە خزمەتیدا بوون و ئەوانەی پـاش جەنابیـشیان هاتوون، هەموو هەر ئیعتیکافیان کردووە. ئیعتیکـاف هـەر چـەندە خێریکـی چاکە، بەڵام حەدیسێکی وا بە هێزی لەسـەر نـەهاتووە. ئیمـامی ئـەبو داوود دەفەرموێ: لە ئیمام ئەحمـەدم پرسـی: ئـەرێ هـیچ شـتێك دەربـارەی فـەزڵ و گەورەیی ئیعتیکاف دەزانیت؟ فەرمووی: نەخێر، مەگەر حەدیسی زەعیف.

٣- **بەشەکانی**: ئیعتیکاف دەبێت بە دوو بەشەوە: سوننەت و فەرز.

ئیعتیکافی سوننەت ئەوەیە، کە موسوڵمان لەبەر خاتری خوای گەورە و بۆ نزیك بوونەوە لێی و بە ئومێدی وەدەست هێنانی پاداشت و ڕەزامەنـدی خـوای گـەورەو وەك سوننەتی پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتێکدا بە نییەتی ئیعتیکـاف دەمێنێتـەوە. ئەویش لە دە رۆژی ئاخیری رەمەزاندا.

ئیعتیکافی فەرز ئەوەیە کە موسـوڵمانێك لەسـەر خـۆی نـەزر کـردووەو بۆتـە فەرزێك لەسەری، کە دەبێت بیکات. بۆ نموونە ووتوێتی: شەرت بێـت بـە شـەرتی خوا ئەوەندە رۆژ ئیعتیکاف بکەم. یان بە شتێکیەوە پەیوەست کردووە. بـۆ نموونـە

---

[١] البخاري: کتاب الصوم – باب الاعتکاف في العشر الأواسط من رمضان (٣ / ٧٤، ٧٥)، وابن ماجه: کتاب الصیام – باب ما جاء في الاعتکاف (١ / ٥٦٢، ٥٦٣)، برقم (١٧٧٠)، وأبو داود: کتاب الصیام – باب الاعتکاف (٢ / ٨٣٠)، برقم (٦٤٦٣).

ووتوویەتی: ئەگەر خوا بکات و ئەم نەخۆشیەم یان ئەم نەخۆشەم چاك بێتەوە مەرج بێت ئەوەندە رۆژ ئیعتیکاف بکەم. لەم حاڵەتانەشدا ئیعتیکـاف کردنەکـە واجبـەو دەبێت ئەنجام بدرێت. چونکە لە سـەحیحی بوخاریـدا هـاتووە کـە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ نَذَرَ أنْ يُطِيعَ اللّهَ، فَلْيُطِعْهُ)[1] واتە: هەر کەس نەزرێکی لە خـۆ گرتبوو کە گوێ رایەڵی فەرمانێکی خـوا بکـات بـا بیکـات. هـەروەها هـەر لـە بوخاریدا هاتووە کە سیدنا عومەر ـ خوا لێی رازی بێت ـ پرسـی: (إنِّـي نَـذَرْتُ في الجاهليةِ أنْ أعْتَكِفَ ليلةً في المسجِدِ الحَرامِ. فقـالَ: أوْفِ بنَـذْرِكَ)[2] واتـە: ئـەی پێغەمبەری خوا نەزرم کردووە شەوێك لە مزگەوتی حەرام (کەعبـە) دا بمێنمـەوە، فەرمووی: نەزرەکەت بێنە دی.

٤- **کاتەکەی:** ئیعتیکـافی نـەزر بـە گـوێرەی کاتـە نـەزر کراوەکەیـە، گـەر خاوەنەکەی ووتبێتی نەزری رۆژێکم لەسەر بێت یان دوو یان سێ، هەر ئەوەنـدە ئیعتیکاف دەکات کە بڕیاری لەسەر داوە.

ئەمما ئیعتیکافی سوننەت کاتی دیاری کراوی نییە. چونکە خـۆی بـە گـوێرەی نییەتەکەیە کە کابرا دەیەوێت چەند لە مزگەوتەکەدا بمێنێتەوە. زۆر بێت یـان کـەم مەیلی خۆیەتی و پاداشتیشی بێ گومان بە گوێرەی زۆرو کەمی مانەوەکەیـەتی.. ئەگەر پێویستی کرد و چووە دەرەوەو پاشـان هاتـەوەو بـە تـەما بـوو ئیعتیکـاف بکاتەوە، نییەتەکەی تازە دەکاتەوە. یەعلای کوڕی ئومەییە فەرمووی: من جـاری وا هەیە لە مزگەوت بە نییەتی ئیعتیکاف بۆ ماوەیەك دەمێنمـەوە. عـەطـائـیش

---

[1] البخاري: كتاب الأيمان والنذور – باب النذر فيما لا يملك، وفي معصيته (١٧٧/٨) والنسائي: كتاب الأيمان والنذور، باب النذر في الطاعة (٧ / ١٧)، برقم (٣٨٠٦)، وأبو داود: كتاب الأيمان والنذور _ باب ما جاء في النذر في المعصية (٣ / ٥٩٣)، برقم(٣٢٨٩)، والترمذي: كتاب النذور والأيمان – باب من نذر أن يطيع اللّه، فليطعه (١٠٤/٤ـ١٠٥) وقال الترمذي: حديث حسن، ومسند أحمد (٦ / ٣٦،٤١،٢٢٤).

[2] البخاري: كتاب الاعتكاف – باب الاعتكاف ليلاً (٣ / ٦٣).

فەرمووی: تا بێنێتەوە هەر بە ئیعتیکاف بۆی حسێبە. کەسێك هەر کە لە مزگەوت بە نییەتی خواپەرستی بێنێتەوە، ئەوە ئیعتیکافی کردووە. گەر نییەتەکەشی وا نەبوو ئەوە هیچ. ئەوی لە ئیعتیکافی سوننەتدایە هەر کاتێك حەزی کرد بۆی هەیە پێش تەواو بوونی ئەو ماوەی دیاری کرد بوو، ئیعتیکافەکەی کۆتایی پێ بهێنێت. دایکە عائیشە ـ خوا لێی رازی بێت ـ دەگێڕێتەوە: (أن النبي ﷺ كان إذا أراد أن يعتكف، صلى الفجر، ثم دخل معتكفه. وأنه أراد مرة أن يعتكف في العشر الأواخر من رمضان، فأمر ببنائه، فضرب. قالت عائشة: فلما رأيت ذلك، أمرت ببنائي، فضرب، وأمر غيري من أزواج النبي ﷺ ببنائه، فضرب، فلما صلى الفجر، نظر إلى الأبنية، فقال: "ما هذه؟ آلبرّ تردْن". قالت: فأمر ببنائه، فَقوض، وأمر أزواجه بأبنيتهن، فقوضت، ثم أخر الاعتكاف إلى العشر الأول، يعني من شوال، فأمر رسول اللّه ﷺ نساءه بتقويض أبنيتهن)[١] کە پێغەمبەر ﷺ گەر بیویستایە ئیعتیکاف بکات، نوێژی بەیانی دەکردو دەچووە جێ ئیعتیکافەکەی. جارێك ویستی لە دە رۆژی ئاخیری رەمەزانێکدا ئیعتیکاف بکات، فەرمانی دا، شوێنێکیان لە مزگەوتەکەدا بۆ تەرخان کرد، منیش کە ئەوم دی داوام کرد شوێنێکیش بۆ ئیعتیکافی من دیاری کەن، ئیتر خێزانەکانی تریشی داوایان کردو بۆیان دیاری کرا، کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی بەیانی کردو ئەو هەموو جێ ئیعتیکافەی بینی، فەرمووی ئەمە چییە؟ ئیدی ئەو ئەوەی خۆی تێك دایەوەو فەرمانی بە خێزانەکانیشی دا تێکی دەنەوە، منیش ئەوەی خۆم تێك دایەوە، ئیتر کاتی ئیعتیکافەکەی خۆی لە رەمەزانەوە گواستەوە بۆ دە رۆژ لە مانگی شەووال..

---

[١] البخاري: كتاب الاعتكاف – باب الأخبية في المسجد (٣ / ٦٣)، ومسلم: كتاب الاعتكاف – باب متى يدخل من أراد الاعتكاف في معتكفه (٢ / ٨٣١) برقم (٦)، وأبو داود: كتاب الصوم _ باب الاعتكاف (٢ / ٨٣١)، برقم (٢٤٦٤).

ئەمەش بەڵگەیە کە موسوڵمان دەتوانێت شوێنێك لە ناو مزگەوتدا بۆ ئیعتیکافی خۆی دیاری بکات، بەو مەرجەی رێ لە نوێژو خواپەرستی خەڵکی تر نەگرێت، بۆ نموونە لە گۆشەیەکی پشتەوەی مزگەوتەکە بێت. هەروەها بەڵگەشە بۆ ئەوەی کە پیاو بۆی هەیە خێزانی خۆی لەو جۆرە ئیعتیکافەو لە مزگەوتدا بێ رەزامەندی پیاوەکە خۆی، بگرێتەوە واتە نەیهێڵێت ئیعتیکاف بکات، ئەمەش رای ئیمامی شافیعی و ئەحمەدو داوودو هی ترە..

٥- **مەرجەکانی**: ئەو کەسەی ئیعتیکاف دەکات مەرجە کە موسوڵمان بێت، لە لەش گرانی (لەش پیسی) و حەیزو زەیستانی پاك بوو بێتەوە. کەوا بوو ئیعتیکاف بۆ کافرو منداڵ و لەش گران و حەیزدارو زەیستان ناشێت.

٦- **روکنەکانی**: ئیعتیکاف کە مانەوەیە لە مزگەوت بە نییەتی خواپەرستی. لە غەیری مزگەوت نابێت و بە نییەتی غەیری خواپەرستیش ناشێت. چونکە لەبەر گرنگی و روکنێتی نییەتە کە خوای گەورە دەفەرموێ: (**وَمَا أُمِرُوا إِلاَّ لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ**) ٩٨ البينة/٥) واتە: هەر وایان فەرمان پێ کرا بوو کە تەنها خوای گەورە بپەرستن وپەرستنەکانیان تایبەت بەو کەن. پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: (**إنما الأعمال بالنيات، وإنما لكل امرئ ما نوى**) واتە: هەموو کارێك هەر بە گوێرەی نییەتەکەیەتی، خەڵکیش هەر یەك نییەتێکی هەیە.

ئەمما کە دەبێت ئیعتیکافەکە لە مزگەوتدا بێت، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: (**وَلاَ تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنْتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ**) ٢ البقرة/١٨٧) واتە: کاری سەرجێیی لەگەڵ خێزانەکانتاندا ئەنجام مەدەن لەو کاتانەی کە ئیعتیکافتان لە مزگەوت کردووە. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئیعتیکاف کردن لە مزگەوت دەبێت.

**٧- ئەو مزگەوتانەی ئیعتیكافیان تێدا دەكرێت:** را جوێییەك لە نێوان زانایاندا دەربارەی ئەو مزگەوتانەی كە بۆ ئیعتیكاف دەشێن هەیە. ئیمامی ئەبو حەنیفەو ئەحمەد و ئیسحاق و ئەبو ثور رایان وایە كە لەو مزگەوتانەدا دەكرێت كە پێنج فەرزەی نوێژیان بە جەماعەت تێدا دەكرێت. ئیمامی مالیك و شافیعی و داوود دەفەرموون لە هەموو مزگەوتێكدا دەشێت بكرێت، چونكە هیچ بەڵگەیەكی بەهێز لەسەر تایبەت كردنی جۆری مزگەوت نەهاتووە.

مەزهەبی شافیعی دەفەرموێ: چاكتر وایە لە مزگەوتی جامیع دا ئیعتیكاف بكات. واتە ئەو مزگەوتەی كە نوێژی كۆمەڵ و هەینی (جومعەو جەماعەت) تێدا بكرێت. چونكە پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتی جامیع دا كردوێتی، چونكە بەردەوام نوێژی جەماعەتی تێدا دەكرێت. بالە مزگەوتێكدا نەیكات كە نوێژی جومعەی تێدا ناكرێت تا ناچار نەبێت بۆ جومعە كردنەكەی بڕواتە دەرەوەو ئیعتیكافەكەی بەتاڵ كاتەوە.

موعتەكیف (ئەو كەسەی لە ئیعتیكاف دایە) بۆی هەیە بچێتە سەر هەیوانو حەوشەو سەربان ومنارەی مزگەوتەكە بۆ بانگدان بەو مەرجەی رێی هەموویان هەر لە دەرگای مزگەوتەكەوە (لە شوێنی ئیعتیكافەكەیەوە) بۆیان بچێت، چونكە هەموویان هەر بە ناو مزگەوتەكە حسێبن. ئەمما ئەگەر رێی یەكێكیان (بۆ نموونە منارەكە) پێویستی دەكرد لە مزگەوتەكە بچێتە دەرەوەو لەوێوە سەركەوێتە سەری، ئەوە ناشێت، چونكە بە چوونە دەرەوەكەی ـ گەر بە ئەنقەست بوو ـ ئیعتیكافەكەی بەتاڵ دەبێتەوە. بە رای ئیمامی مالیك و رایەكی ئیمامی ئەحمەد موعتەكیف بۆی نییە بچێتە هەیوان و حەوشەكەش چ جای سەربان و سەر منارەكە، بەڵام لە مەزهەبی حەنەفی و شافیعی و ریوایەتێكی تری ئیمام ئەحمەد بۆی هەیە بچێتە هەموویان مادام هی مزگەوتەكە بن.

جمهوری زانایان دەفەرموون ئافرەت بۆی نییە ئیعتیكاف لە جێ نوێژی ماڵەكەی خۆیدا بكات، چونكە سیفەتی مزگەوتی نییە. بەڵام ئەویش وەكو پیاو

دەتوانێت لە مزگەوتێکدا ئیعتیکاف بکات. چونکە خێزانە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ ئیعتیکافیان لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ دەکرد.

٨- **رۆژوو گرتنی موعتەکیف**: لە غەیری رەمەزاندا، ئەگەر موعتەکیف لەگەڵ ئیعتیکافەشیدا بەڕۆژوو بێت چاکترە، بەڕۆژووش نەبێت هیچی لەسەر نییە. بوخاری لە ئیبنو عومەرەوە ـ خوا لێیان رازی بێت ـ دەگێڕێتەوە، کە سەیدنا عومەر لە پێغەمبەری ﷺ پرسی: (**إنِّي نَذَرْتُ في الجاهليةِ أنْ أعْتَكِفَ ليلةً في المسجدِ الحَرامِ. فقالَ: أوْفِ بنَذْرِكَ**)[١] واتە: ئەی پێغەمبەری خوا نەزرم کردووە شەوێك لە مزگەوتی حەرام (کەعبە) دا بمێنمەوە، فەرمووی: نەزرەکەت بێنە دی. ئەم حەدیسە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە رۆژوو مەرجێك نییە لە ئیعتیکاف کردن. چونکە خۆ رۆژوو بەشەو ناگیرێت. سەعیدی کوڕی مەنسور (مامۆستای ئیمامی موسلیمە) لە ئەبو سەهلەوە دەگێڕێتەوە: ئافرەتێکمان نەزرێکی لە خۆ گرتبوو، بۆم لە عومەری کوڕی عبدالعزیز پرسی، فەرمووی: رۆژووی لەسەر نییە، مەگەر خۆی بیەوێت بیگرێت. ئیمامی زوهری کە هەر لەو کۆڕەدا بوو، فەرمووی: ئیعتیکاف بێ رۆژوو نابێت. عومەری کوڕی عبدالعزیز لێی پرسی: هیچ بەڵگەیەکت لە پێغەمبەرەوە هەیە؟ فەرمووی: نەخێر، عومەر پرسی: ئەدی قەولێکی ئەبو بەکر؟ فەرمووی: نەخێر، عومەر پرسییەوە: ئەدی هی عومەر؟ فەرمووی: هی ئەویش (واتە هی ئەویشم هەر نییە)، سەهل دەفەرموێ وا بزانم دیسان عومەر لێی پرسیەوە: ئەدی هی عوسمانت هەیە؟ فەرمووی نەخێر هی ئەویشم نییە.. لە کۆڕی ئەوان هاتمە دەرێ ئیمامی عەطاء و طاووسم بینی لەوانیشم پرسی: ئەوانیش هەر فەرموویان: رۆژووی لەسەر نییە، مەگەر خۆی لە زیادە بیگرێت.

ئیمامی الخطابي دەفەرموێ: خەڵکی لەم مەسەلەیەدا راجوێن. حەسەنی بەسری و شافیعی دەفەرموون: ئیعتیکاف بێ رۆژوو دەشێت. سەیدنا عەلی و

---

[١] البخاري: كتاب الاعتكاف – باب الاعتكاف ليلاً (٣ / ٦٣).

سەیدنا ئیبنو مەسعود فەرموویانە: کەیفی خۆیەتی، دەتوانێت بەرۆژوو بێت و دەشتوانێت بەرۆژوو نەبێت. بەڵام ئیمامی مالیك و ئەوزاعی هەر دەفەرموون: حەتمەن ئیعتیکاف دەبێت رۆژووی لەگەڵ بێت. ئەمە رای ئەهلی رەئی و سەعیدی کوڕی موسەییب و عوروەی کوڕی الزوبەیریشە.

٩- **کاتی سەرەتاو کۆتایی ئیعتیکاف**: ووتمان ئیعتیکافی سوننەت کاتێکی دیاری کراوی نییە. هەر کاتێك موعتەکیف چووە مزگەوتێك و نییەتی وا بوو ئیعتیکاف دەکات، تا دێتە دەرەوە ئیعتیکافی بۆ حسێبە. ئەگەر کەسێك ویستی دە رۆژی کۆتایی رەمەزان ئیعتیکاف بکات، ئەوە پێش خۆرئاوا بوون دەچێتە جێ ئیعتیکافەکەی. چونکە بوخاری دەگێرێتەوە، کە سەیدنا ئەبو سەعید ـ خوا لێی رازی بێت ـ گێراویێتییەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مَنْ كانَ اعْتَكَفَ مَعِيَ، فَلْيَعْتَكِفْ العَشْرَ الأواخِرَ)[1] واتە: ئەو کەسەی لەگەڵ من ئیعتیکاف دەکات، با دە رۆژەکەی ئەخیر بیکات. یەعنی رۆژی بیستەم، یان بیست و یەکەمی رەمەزان. هەروەها حەدیسی موسلیم کە دەفەرموێ: (كانَ إذا أرادَ أنْ يَعْتَكِفَ، صلَّى الفَجْرَ، ثُمَّ دَخَلَ مَعْتَكفه)[2] واتە: کە پێغەمبەر ﷺ بیویستایە ئیعتیکاف بکات، نوێژی بەیانییەکەی دەکردو تەشریفی دەبردە جێ ئیعتیکافەکەی. یەعنی ئەو جێگایەی، کە لەناو مزگەوتەکەدا بۆ ئیعتیکافی خۆی تەرخانی کردبوو. ئەمما کاتی تەشریف بردنی بۆ مزگەوت بە مەبەستی ئیعتیکاف، هەر لە سەرەتای شەوەوە دەبوو.

---

[1] البخاري: كتاب الصوم – باب الاعتكاف (٣ / ٦٢).

[2] مسلم: كتاب الاعتكاف - باب متى يدخل من أراد الاعتكاف (٢ / ٨٣١) وابن ماجه: كتاب الصيام – باب ما جاء فيمن يبتدئ الاعتكاف (١ / ٥٦٣) برقم (١٧٧١) وأبو داود: كتاب الصوم – باب الاعتكاف(٢/٨٣٠) برقم (٢٤٦٤) والترمذي: كتاب الصيام – باب ما جاء في الاعتكاف (١٤٨/٣) برقم (٧٩١) والنسائي: كتاب المساجد – باب ضرب الخباء في المساجد (٢ /٤٤) برقم (٧٠٩)

هەر کەس لە دە رۆژی کۆتایی رەمەزاندا ئیعتیکافی کرد، لە دوای خۆر ئاوا بوونی کۆتا رۆژی رەمەزان کۆتایی بە ئیعتیکافەکەی دەهێنێت. ئەمەش رای ئیمامی ئەبو حەنیفەو ئیمامی شافیعییە. ئیمامی مالیك و ئیمامی ئەحمەد دەفەرموون: موعتەکیف بۆی هەیە دوای ئاوا بوونی خۆری کۆتا رۆژی رەمەزان کۆتایی بە ئیعتیکافەکەی بهێنێت، بەلاّم ئەگەر بەردەوام لە ئیعتیکافەکەیدا بمێنێتەوە تا ئەو کاتەی سبەینیّ دەڕواتە دەریّ بۆنوێژی جەژن، چاکترە. ئەمەش ـ وەکو الاثرم لە ئەبو ئەییوب و ئەویش لە ئەبو قەلابەوە دەگێڕێتەوە ـ کە پیشەی یاوەرانی پێغەمبەر بووە، ئەوان هەمیشە حەزیان دەکرد کە شەوی جەژنی رەمەزانەکەش تا نوێژی جەژن هەر لە ئیعتیکافەکەیاندا بمانایەتەوە. پاشان بە چوونیان بۆ نوێژی جەژن کۆتاییان بە ئیعتکافەکانیان دەهێنا.

ئەو کەسەی ئیعتیکافێکی نەزری لە خۆ گرتووە، جا لە رۆژانی رەمەزاندا بێت، یان لە رۆژانی تر، بە هەمان شێوە پێش ئەوەی سپێدەی ئەو رۆژە دیاری کراوەی هەلّ بێت، دەبیّ بچێتە جیّ ئیعتیکافەکەی و ئەو ماوەیەی خۆی نەزری کردووە تێیدا بمێنێتەوە تا دەبینێت خەپلەی خۆر (قرىَ الشمس) ی کۆتا رۆژی نەزر کراوی بە تەواوی ئاوا بوو، ئیتر کۆتایی بە ئیعتیکافەکەی دەهێنێت. ئەگەر نەزری کەسێك شەو بوو، یان وویستی شەوێك یان چەند شەوێك ئیعتیکافی سوننەت بکات، ئەویش دەبێت ئەو ساتەی کە بینی خەپلەی خۆر وا ئاوا بوو بچێتە جیّ ئیعتیکافەکەیەوە. بۆ کۆتایی پیّ هێنانیشی ئەو کاتە دەبێت کە لە هەلّهاتنی خۆر دلّنیا دەبێت.

ئیمامی ئیبنو حەزم دەفەرمویّ: چونکە سەرەتای شەو بریتیە لە ئاوا بوونی خۆر. کۆتا هاتنیشی بریتیە لە هەلّهاتنەوەی خۆر. هەر وەکو کە سەرەتای رۆژ بریتیە لە هەلّهاتنی خۆر و کۆتا هاتنیشی بریتیە لە ئاوا بوونی، کەوا بوو کەس بۆی نییە کاتی زیادە لەسەر خەلّکی فەرز کات، هەر کەس و هەر چەندێکی نەزر کرد یان بڕیار دا ئیعتیکافی تێدا بکات ئیتر ماوەکە هەر ئەوەیە. ئەگەر ئیعتیکافی

مانگێکی نەزر کردبوو، یان هەر وەکو سوننەتێك وویستی مانگێك ئیعتیکاف بکات لەسەرەتای یەکەم شەویەوە دەست پێ دەکات. ئینجا پێش ئەوەی خەپلەی خۆر بە تەواوی ئاوا ببێت دەچێتە جێ ئیعتیکافەکەی و بە ئاوا بوونی هەموو خەپلەی خۆری کۆتا رۆژی نەزرەکەی کۆتایی بە ئیعتیکافەکەی دەهێنێت، ئیتر لە رەمەزاندا بێت یان غەیری رەمەزان.

١٠- **ئەوی چاکە یان خراپە بۆ موعتەکیف:** شتێکی چاکە موعتەکیف خواپەرستی وەکو نوێژوقورئان خوێندن و زیکرو تەسبیحات زۆرتر بکات. تەسبیحاتی وەکو **سبحان الله والحمد لله ولا اله الا الله والله اكبر واستغفر الله** و سەڵەوات دان لە پێغەمبەرو ﷺ دوعاو زۆر پاڕانەوەو هی تر.. چونکە ئەمانە هەموویان عیبادەتن و موسوڵمان زیاتر لە خوای پەروەردگار نزیك دەکەنەوەو خۆشەویستی ئەوی زیاتر لە دڵ و دەروونندا دەچەسپێنن.

خوێندنی دینیش هەر لە ریزی ئەم خێرو چاکانەن: وەکو تەفسیرو حەدیس و بابەتەکانی تری عیلمی شەرعی، هەروەها سیرەی ژیانی پڕ بەرەکەتی پێغەمبەران و پیاوچاکان و شەهیدان. باشتریش وایە شوێنێکی مزگەوتەکە بۆ خۆی دیاری بکات کە هەر لەو شوێنەدا زۆرتر بمێنێتەوە هەروەکو، کە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ وای دەکرد.

باش نییە بۆ موعتەکیف خۆی بە قسەو قسەلۆك و شەڕە دەمەوە خەریك کات، یان خۆ لە کاروبارو قسەیەك هەڵقورتێنێت، کە پەیوەندی بەوەوە نییە. موسوڵمان ـ نەك هەر لە ئیعتیکافیدا ـ بەڵکو لە هەموو کاتێکیدا هەر دەبێت ئەمە رەفتاری بێت، وەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (مِنْ حُسْنِ إسْلامِ المرءِ، تركُهُ ما لا يَعنيه)[1] واتە: لە دینداری و ئیسلامخوازی کابرا ئەوەیە، واز لەو شتانە بێنێت، کە پەیوەندییان بەمەوە نییە..

---

[1] الترمذي: كتاب الزهد _ باب (١١) حديث رقم (٢٣١٧) (٤ / ٨٥٨، ٨٥٩)، وقال: حديث غريب. وابن ماجه: كتاب الفتن – باب كف اللسان في الفتنة (٢ / ١٣١٥، ١٣١٦).

هەندێ کەس وا دەزانێ ئەگەر خۆی لە قسە کردن لەگەڵ خەڵکی بگرێتەوە بۆ ئیعتیکافەکەی چاکەو زیاتر لە خوای گەورە نزیك دەبێتەوە! بەڵام ئەمە وا نییە. ئیمامی بوخاری و ئەبو داوودو ئیبنو ماجە لە ئیبنو عەبباسەوە ـ خوا لێی رازی بێت ـ گێڕاویانەتەوە کە جارێك پێغەمبەر ﷺ لەسەر مینبەر بوووتاری دەفەرموو، بینی وا پیاوێك هەر بە پێوەیەو دانانیشێت، پرسیاری دەربارەی کرد، ووتیان: ئەوە ئەبو ئیسرائیلە، نەزری کردووە کە هەر بە پێوە بێت و دانەنیشێت، قسەش ناکات و بەرۆژووشە.. فەرمووی: (مُرْهُ فَلْيَتَكَلَّمَ، وليَسْتَظِلَّ، وليَقْعُدَ، وليُتِمَّ صومَهُ) [1] واتە: فەرمانی پێ بکەن با قسە بکات، با بشچێتە بەر سێبەر، با داشنیشێت و رۆژووەکەشی تەواو کات. هەروەها ئەبو داوود لە رێگای سیدنا عەلییەوە ـ خوا لێی رازی بێت گێڕاوێتییەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا يُتْمَ بعدَ احتلامٍ، ولا يَماتَ يومٍ إلى الليل) [2] واتە: دوای بالغ بوون هەتیووی نامێنێت و هیچ بێ دەنگیەکیش نابێت بگاتە شەو..

## ئەوی بۆ موعتەکیف دەشێت

ئەمانەی خوارەوە بۆ موعتەکیف جائیزە:

١ـ چوونە دەرەوەی لە جێ ئیعتیکافەکەی بۆ خوا حافیزە کردن و ماڵئاوایی لە ماڵ و منداڵ و کەس و کاری. خاتوو سەفییە ـ خوا لێی رازی بێت ـ فەرمووی: (كانَ رسولُ اللّه ﷺ مُعْتَكِفاً، فأتيتُهُ أزورُهُ لَيلاً، فَحَدَّثْتُهُ، ثُمَّ قُمْتُ، فانقلبْتُ، فقامَ مَعْيَ لِيَقْلِبَنِي، وكان مسكنها في دار أسامة بن زيد، فمر رجلان من الأنصار، فلما رأيا النبي ﷺ، أسرعا، فقال النبي ﷺ: على رسْلكما؛ إنها

---

[1] البخاري: كتاب النذور والأيمان – باب النذر فيما لا يملك (٨ / ١٧٨)، وأبو داود: كتاب الأيمان والنذور – باب من رأى عليه كفارة إذا كان في معصية (٣ / ٥٩٩)، برقم(٣٣٠٠) ، وابن ماجه كتاب الكفارات – باب من خلط في نذره طاعة بمعصية، برقم(٢١٣٦) .

[2] أبو داود: كتاب الوصايا – باب ما جاء متى ينقطع اليتم (٣ / ٢٩٣، ٢٩٤) برقم (٢٨٧٣).

صفية بنت حُيَيّ. قالا: سبحان اللّه، يا رسول اللّه. قـال َ: إنَّ الـشيطانَ يجـري مِنْ الإنسانِ مَجْرَى الدَّمِ، فَخَشِيتُ أنْ يَقْذِفَ فِي قُلُوبِكُما شَيئاً. أو: قـال: شـرّا )[١] رواه البخاري، ومسلم، وأبـو داود ) واتـه: پێغـەمبـەر ﷺ لە ئیعتیکافدا بوو منیش شەوێك هاتم سەرم لێدا (خاتوو سـەفییە خێزانـی پێغەمبـەرە ﷺ)، قـسەم لەگەڵـدا كـردو پاشان كە هەستام بڕۆمەوە، ئەویش هەستاو تەشـریفی هێنـاو لەگەڵمـدا هاتـەوە، ماڵی دایكە سەفییە لای ماڵی ئوسامەی كوڕی زەیدەوە بوو، دوو پیاوی ئەنـساری لەو كاتەدا بەوێدا تێپەڕین كە پێغەمبەریان بینی ﷺ پەلەیان كردو خێرا تێپەڕین، پێغەمبەر ﷺ بانگی كردنیّ كە لەسەر خـۆ بـن، پەلـە مەكـەن، بـا بـزانن ئەمـە سەفییەی كچی حوییەیە لەگەڵمدا، هـەردووكیان فـەرموویان: سـوبحان اللـه ئـەی پێغەمبەر خوا(واتـە: پـاك و بـێ خەوشـی بـۆ خـوا، چـۆن گومـان لـە بـەڕێزتان دەكرێت؟!!) پێغەمـبەر ﷺ فەرمووی: شەیتان وەكـو خـوێن بـە دەمـاری مرۆڤـدا دەگەڕێت، منیش لەوە ترسام شتێك (یان خراپەیەك) فڕێ داتە دڵتانەوە. ئیمـامی شافیعی ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێـت ـ دەفـەرموێ: لـە ڕووی بـەزەیی و بەخەمـەوە هاتنیانەوە ئەوەی بۆ ڕوون كردنەوە، چونكە ئەگەر گومانی خراپیان بـە پێغەمبـەر ﷺ ببردایە، پێی كافر دەبوون. بۆیە خێرا خۆی بۆی ڕوون كردنەوە نـەبادا تووشـی ئەو كێشە گەورەیە ببن.

(الخطـابي دەفـــەرموێ: تەشـــریفی لەگەڵـــدا ڕۆیـــشتۆتەوە تابـــە ڕێـــی كردۆتەوەئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوە كە چوونە دەرەوەی پێویست، ئیعتیكـاف بـەتاڵ ناكاتەوە، ئیعتیكاف ڕێ لە چاكە كردنی تر ناگرێت).

٢ـ سەرتاشین و قژ داهێنان و نینۆك كردن و خۆ پاك كردنـەوە لـە چـڵك و تـووك، هەروەها پۆشینی جل و بەرگی جوان و خۆ ڕێك و پێـك خـستن و بـەكارهێنانی

[١] البخاري: كتاب الاعتكاف – باب هل يدرأ المعتكف عن نفسه (٣ / ٦٥)، ومسلم: كتـاب السلام – باب يستحب لمن رئي خالياً بامرأة، وكانت زوجته أو محرماً له، أن يقو ل: هذه فلانة، برقم (٢٤) وأبو داود: كتاب الصوم – باب المعتكف يدخل البيت لحاجنه، برقم (٢٤٧) (٢/٨٣٥).

بۆنی خۆش.. خاتوو عائیشه ـ خوا لێی رازی بێت ـ دەگێڕێتەوە کە (كانَ رسولُ اللّه ﷺ يَكونُ مُعْتَكِفاً في المسجِد، فَيُناوِلَني رَأسَهُ مِنْ خَلَلِ الحُجْرةِ، فَأَغْسِلَ رأسَهُ) – وقال مسدد: فأرَجِّلَهُ_ وأنا حائض[1] رواه البخاري، ومسلم، وأبو داود، واتە: پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوت لە ئیعتیکافدا دەبوو، لە سووچی جێ ئیعتیکافەکەی خۆیەوە سەری دەهێنایە ئەمدیوو، بۆم دەشت، بۆم شانە دەکرد. لە ریوایەتی موسلیمدا ـ خوا لێی رازی بێت ـ هاتووە، کە دەفەرموێ: لە حەیزیشدا دەبووم، کە وام بۆ دەکرد.

٣ـ چوونە دەرەوە بۆ ئەو پێداویستانەی کە زەرورین. خاتوو عائیشە ـ خوا لێی رازی بێت ـ دەگێڕێتەوە کە (كانَ رسولُ اللّه ﷺ إذا اعْتَكَفَ، يُدني إليَّ رأسَهُ، فأرَجِّلَهُ، وكانَ لا يَدْخُلُ البيتَ، إلا لحاجَةِ الإنسان)[2] رواه البخاري، ومسلم، وغيرهما واتە: پێغەمبەر ﷺ کە لە ئیعتیکافیدا دەبوو، سەری پیرۆزی لە من نزیك دەکردەوەو منیش بۆم دا دەهێنا (بۆم شانە دەکرد). بۆ پێداوییستی مرۆڤیانەی خۆی نەبوایە نەدەهاتەوە ماڵێ.

شەرعناسان لەسەر ئەوە کۆن کە موعتەکیف بۆ خواردن و خواردنەوە ـ ئەگەر کەس بۆی نەدەهێنا ـ دەچێتە دەرەوە، هەروەها ئەگەر رشانەوەش ناچاری کرد، یان هەر کارو پێداوویستییەك کە وای دەخواست لە جێ ئیعتیکافی بچێتە دەرەوە بۆی هەیە بچێت و بێ خەم بێ لە ئیعتیکافەکەی.

---

[1] البخاري: كتاب الاعتكاف – باب الحائض ترجل المعتكف (٣ / ٦٣)، ومسلم: كتاب الحيض – باب جواز غسل الحائض رأس زوجها وترجيله (٢٤٤/١) برقم (٩) وأبو داود: كتاب الصيام – باب المعتكف لا يدخل البيت إلا لحاجة (٨٣٤/٢ برقم (٢٤٦٩)

[2] البخاري: كتاب الاعتكاف – باب لا يدخل البيت إلا لحاجة (٦٣/٣)، ومسلم: كتاب الحيض – باب جواز غسل الحائض رأس زوجها (١ / ٢٤٤)، برقم (٦)، وأبو داود: كتاب الصوم _ باب المعتكف يدخل البيت لحاجته (٢ / ٨٣٤)، برقم (٢٤٦٧)، والترمذي: كتاب الصوم _ باب المعتكف يخرج لحاجة أم لا ؟ (٣ / ١٥٨)، برقم (٨٠٤) وقال: حديث حسن صحيح.

ئەوی وەکو ئەمانەش وایە هەر هەمان حوکمی هەیە وەکو چوونە دەرەوە بۆ خۆشتن و غوسڵ دەرکردن و جل و بەرگ شتن و..

سەعیدی کوڕی مەنسوور لە سیدنا عەلییەوە ـ خوا لێی رازی بێت ـ گێڕاوێتیەوە کە فەرموویەتی: (إذا اعْتَكَفَ الرَّجُلُ، فليشْهَدْ الجُمُعَةَ، ولْيَحْضُرْ الجَنَازةَ، ولْيَعُدْ المريضَ، وليأتِ أهلَهُ يَأمُرُهُم بحاجَتِهِ، وهو قائمٌ)[١] ئەگەر کەسێك ئیعتیکافی کرد، با بچێتە نوێژی جومعە و ئامادەی جەنازە بردنە گۆڕستان بێت و سەردانی نەخۆش و سەردانەوەی ماڵەوە بۆ زانینی پێداویستییان یان بۆ جێبەجێکردنی پێویستی خۆی بکات. بە مەرجێك هەر بە پێوە بێت و دانەنیشێت. جارێکیش خوشکەزایەکی خۆی (هی سیدنا عەلی) لە ئیعتیکافدا بوو حەوت سەد درهەمی لێ وەرگرتبوو ناردبووی، تا رەنجبەرێکی بۆ پێ بکڕن، سەیدنا عەلی پێی فەرموو: جا قەیدی چ بوو، گەر خۆت بچوویتایەتە بازاڕو رەنجبەرەکەت بکڕیایە

قەتادە دەفەرموێ: موعتەکیف بۆی هەیە لەگەڵ خەڵکی بۆ ناشتنی مردوو بچێتە گۆڕستان، هەروەها بۆ لای نەخۆش بەو مەرجەی دانەنیشێت. ئیبراهیمی نەخەعی دەفەرموێ: کاتی خۆی رێیان بە موعتەکیف دەدا ئەو شتانە بکات وەکو چوونە نوێژی جومعەو سەردانی نەخۆش و مردوو ناشتن و چوونە دەرەوە بۆ راپەڕاندنی پێداوویستی خۆی، گرنگ ئەوە بوو نەچێتە ژێر سایەبانێك بۆ مانەوە.

الخطابي دەربارەی ئەوەی لەسەرێ باس کرا دەفەرموێ: ئەوە رای سیدنا عەلیو سەعیدی کوڕی جوبەیرو حەسەنی بەسری و نەخەعییە.

ئەبو داوود لە خاتوو عائیشەوە ـ خوا لێی رازی بێت ـ دەگێرێتەوە: (أنَّ النبيَّ ﷺ كانَ يَمُرُّ بالمَريضِ وهو مُعْتَكِفٌ فَيَمُرُّ كما هُوَ ولا يعرِّج يَسْألُ عَنْهُ)[٢]

---

[١] روى نحوه الدارقطني، في "سننه" (٢ / ٢٠٠).

[٢] أبو داود: كتاب الصوم – باب المعتكف يعود المريض (٢ / ٨٣٦)، برقم (٢٤٧٢)، وقال المنذري في "مختصره": في إسناده ليث بن أبي سليم، وفيه مقال (٣ / ٣٤٣).

واتە: پێغەمبەر ﷺ لە ئیعتیکافدا دەبوو، سەری لە نەخۆش دەدا بە هەواڵ پرسینی کە بە لایدا تێدەپەڕی نەك بە چوونە لای ومانەوە.

کەوا بۆ موعتەکیف دەشێوسوننەتە لە چوونە دەردوەیدا هەواڵی نەخۆش بپرسێت، نەك بە تایبەتی بچێت بۆ لای.

٤- دەتوانێت لە مزگەوت بخواتو بخواتەوەو تێیدا بخەوێت، لەگەڵ پاراستنی پاكو خاوێنیو ئاوەدانکردنەوەی، دیسان بۆشی هەیە رێکەوتن و عەقدی هاوسەرێتیو کڕین و فرۆشتن و شتی واشی تێدا بکات..

## ئەوی ئیعتیکاف بەتاڵ دەکاتەوە

ئەوانەی ئیعتیکاف بەتاڵ دەکەنەوەو ئەمانەن:

١- بە ئەنقەست چوونە دەرەوە لە مزگەوت با بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت، چونکە روکنی سەرەکی ئیعتیکافەکەی پێ بەتاڵ دەبێتەوە.

٢- لە دین هەڵگەڕانەوە ـ خوا لاماندا ـ چونکە کافر و هەڵگەڕاوە خواپەرستییان نەلەسەرەو نە ئەگەر کردیشیان لێیان وەردەگیرێت. خوای گەورە دەفەرموێ: (لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ) ٣٩ الزمر/ ٦٥، واتە: ئەگەر شەریکت بۆ خوا بڕیار دا هەر هەموو کردەوەکانت پووچەڵ دەبنەوە.

٣و٤و٥- نەمانی هۆش و ژیری: بە شێت بوون یان بە سەرخۆشی، هەروەها کەوتنە حەیزو زەیستانیەوە، چونکە ئەمیش مەرجێکی تری ئیعتیکاف بەتاڵ دەکاتەوە کە پاکژی واتایی وبەدەنی و هی جێگاکەیە.

٦- چوونە لای خێزان: هەرکەس موعتەکیف بێت و بچێتە لای خێزانی و کاری سەرجێیی (جیماع) ی لەگەڵدا بکات ئیعتیکافەکەی بەتاڵ دەبێتەوە. چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: (وَلاَ تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ تِلْكَ حُدُودُ اللّهِ فَلاَ تَقْرَبُوهَا) ٢ البقرة/١٨٧، واتە: ئەو کاتانەی لە مزگەوت لە

ئیعتیکافدان توخنیان (هــی خێزانــەکانتان بــە جیمــاع)مەکەونــەوە، ئەمــەش سنووری خوای گەورەیە نزیکی مەکەونەوە.

بەلاَم دەست لێدان بێ ئەوەی ئارەزوو بجولێت جائیزە. چـونکە پێغەمبــەر ﷺ کە ئیعتیکافی دەکرد جار هەبوو، کــە خێزانێکــی ســەری بــۆ شــانە دەکــرد (بــۆی دادەهێنا). ئەمما دەستبازی وماچ کـردن، ئــەوە ئیمــامی ئــەبو حەنیفــەو ئیمــامی ئەحمەد دەفەرموون کارێکی خراپــە، چــونکە حەرامــە، بــەلاَم تــا ئــاوی نەیەتــەوە ئیعتیکافەکــەی بــەتالّ نابێتــەوە. بــەلاَم ئیمــامی مالیــك دەفــەرموێ: هــەر بــە دەستبازیو ماچ کردنەکە، با ئاویشی نەیەتەوە ئیعتیکافەکەی بەتالّ دەبێتەوە. لە ئیمامی شافیعیشەوە هەر دوو راکە هەیە.

ئیبنو روشــد دەفــەرموێ: هــۆی راجوێییەکــەیان مانــای وشــە قورئانیەکەیــە. ئەوانــەی کــە دەفــەرموون: (وَلاَ تُبَاشِـرُوهُنَّ وَأَنـتُمْ عَـاكِفُونَ فِـي الْمَسَاجِدِ) ولا تباشروهن: بە مانای جیماعە. دەفەرموون: دەستبازیو ماچ کردن، مادام رەحەت بوون و ئاو هاتنەوەی لەگەلّ نەبێت، ئیعتیکافەکە بەتالّ ناکاتــەوە. ئەوانــەش، کــە دەفەرموون بە مانای مەجازییە، واتە نزیك خێزانەکانتان مەکەونەوە، دەستبازی و ماچ کردنەکەش دەخەنە چوار چێوەی یاساغ کراوەکەوە.

## گرتنەوەی ئیعتیکاف (قەرز دانەوەی)

ئەو کەسەی چۆتە ئیعتیکافی سوننەتەوەو ـ پاشان بە هەر هۆیەك پێش کۆتایی کاتی دیاریکراوی خۆی کۆتایی پێ هێنا، ئەوە قــەرزارەو باشــتر وایــە بیگرێتــەوە، هەندێکیش دەفەرموون پێویستە بیگرێتەوە.

ئیمامی ترمذی دەفەرموێ: ئەهلی عیلم لە حــوکمی ئــەو موعتەکیفــەدا، کــە ئیعتیکافەکــەی تــەواو ناکــات راجــوێن: ئیمــامی مالیــك دەفــەرموێ: ئەگــەر شکاندبووی، کە کــاتی ئیعتیکافەکــەی تــەواو بــوو، دەبێــت بیگرێتــەوە. چــونکە

پێغەمبەر ﷺ جارێك ئیعتیكافەكەی خۆی لە ڕەمەزاندا شكاند، دوایی لە شەووالدا دە ڕۆژی تر ئیعتیكافی كردەوە. ئیمامی شافیعی دەفەرموێ: ئەگەر ئیعتیكافەكەی نەزر نەبوو، هەر سوننەت بوو، سەرپشكە لەوەی بیگرێتەوە یان نا. خۆ ئەمە حەج و عەمرە نییە.

ئەمما ئەو كەسەی نەزری ڕۆژێك یان چەند ڕۆژێكی لە خۆ گرت و چووە نیعتیكافەكەیەوە، بەڵام پێش تەواو بوونی ماوەكەی شكاندی؛ حەتمەن دەبێت لە ڕۆژانێكی تردا بیگرێتەوە، چونكە قەرزار بووە. ئەمەش كۆڕا (ئیجماع)ی زانایانی لەسەرە. ئەگەر مردوو نەیگرتبۆوە، لەسەری نامێنێت و پێویست ناكات كەس بۆی بگرێتەوە. گەرچی ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێ دەبێت كەس و كارەكەی بۆی بگرنەوە. چونكە عبد الرزاق لە عبدالكریمی كوڕی ئومەییەوە دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: گوێم لێ بوو عبداللەی كوڕی عبداللەی كوڕی عوتبە فەرمووی: دایكمان قەرزاری ئیعتیكافێك بوو كە كۆچی دوایی كرد، بۆمان لە ئیبنو عەبباس پرسی، فەرمووی: ئیعتیكافەكەو ڕۆژێكیشی ڕۆژوو بۆ بگرنەوە. هەروەها سەعیدی كوڕی مەنسوور دەگێڕێتەوە كە خاتوو عائیشە ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ ئیعتیكافی لە جیاتی برایەكی مردووی خۆی كرد.

## موعتەكیف جێیەك لە مزگەوت بۆ خۆی دیاری دەكات یان چادرێك هەڵدەدات

١- ئیبنو ماجە لە سیدنا ئیبنو عومەرەوە ـ خوا لێیان ڕازی بێت ـ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ دە ڕۆژانی كۆتایی ڕەمەزان ئیعتیكافی دەكرد. نافیع دەفەرموێ: عبد اللەی كوڕی عومەر ئەو جێیەی نیشان دام كە پێغەمبەر ﷺ تێیدا ئیعتیكافی دەكرد

٢- هەر لەو گێڕراوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ کە ئیعتیکافی دەکرد بەرماڵیان بۆ ڕادەخست وپێخەفێکیان لای پایەی تەوبەوە بۆ ڕادەخست[1].

٣- ئەبو سەعیدی خودری ـ خوا لێی رازی بێت ـ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە ژێر گومەزێکی تورکیانەدا ئیعتیکافی کرد، حەسیرێکیشی وەکو دیواری چیغ کردبوو بە لای دەرگاکەیەوە (تا کەس نەیڕوانێتیّ).

## نەزری ئیعتیکاف کردن لە مزگەوتێکی دیاری کراو

هەر کەس نەزری ئەوە بکات کە لە مزگەوتی حەرام (کەعبە) یان لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ (لە مەدینە) یان لە مزگەوتی ئەقسا (لە قودس) ئیعتیکاف بکات، دەبێ نەزرەکەی بهێنێتە دی. چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (**لا تُشَدُّ الرِّحَالُ، إلا إلى ثلاثةِ مَساجِدِ؛ المسجدِ الحرامِ، والمسجدِ الأقصى، ومسجدي هذا**) رواه الجماعة (بخاري، مسليم، الترمذي، النسائي، ابو داود، ابن ماجة واحمد[2] واتە: بار لێ نانرێ (واتە: سەفەر ناکرێت بە تایبەتی) مەگەر بۆ سێ مزگەوت نەبێت: مزگەوتی حەرام، مزگەوتی ئەقسا، ئەم مزگەوتەی من.

---

[1] پایەی تەوبە: پایەیەکی مزگەوتەکەی پێغەمبەر بوو ﷺ کە یەکێك لە ئەسحابەکان (ناوی ئەبو لوبابە بوو) نەزری کرد، کە خۆی پێوە ببەستێتەوەو، نە خۆی بیکاتەوە، نە بشهێڵێت کەسی تر بیکاتەوە، تا ئەو کاتەی خوای گەورە تۆبەکەی لێ وەردەگرێت، هەرواش مایەوە تا پێغەمبەر ﷺ مژدەی دایە کە خوای گەورە لێی وەرگرتووە.

[2] البخاري: كتاب التهجد بالليل – باب فضل الصلاة في مسجد مكة والمدينة (٢ / ٧٦)، ومسلم: كتاب الحج – باب لا تشد الرحال، إلا إلى ثلاثة مساجد (٢ / ١٠١٤) برقم (٥١١)، وأبو داود: كتاب المناسك – باب في إتيان المدينة (٢ / ٥٢٩) برقم (٢٠٣٣)، ومسند أحمد(٢/٢٧٨)، وابن ماجه: كتاب الإقامة – باب ما جاء في الصلاة في مسجد بيت المقدس (١ (٤٥٢ / برقم (١٤٠٩)، والنسائي: كتاب المساجد – باب ما تشد الرحال إليه (٢ / ٣٧، ٣٨ (برقم (٧٠٠)، والترمذي: أبواب الصلاة – باب ما جاء في أي المساجد أفضل (٢ / ٣٢٦).

ئەمما ئەگەر کەسێك نەزری کرد لە مزگەوتێکی تردا ئیعتیکاف بکات، مەرج نییە هەر لەو مزگەوتەدا بێت، بەڵکو بۆی هەیە لە هەر مزگەوتێکدا بێت ئیعتیکافەکەی خۆی بکات. چونکە خوای گەورە جێگایەکی تایبەت بە خواپەرستیی دیاری نەکردووە، هیچ مزگەوتێکیش ـ جگە لەو سێ ناو براوە ـ چاکترو ئەفزەڵتر نییە لە مزگەوتێکی تر. تەنها ئەو سێ مزگەوتە ئەو گەورەیی و مەزنییەیان هەیە، ئەویش لەبەر ئەوەی ئایەت و حەدیسی زۆریان لەسەرە. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (صلاةٌ في مسجدي هذا أفضَلُ مِنْ ألفِ صلاةٍ، فيما سِواهُ مِنْ المساجِدِ، إلا المَسْجد الحرامِ، وصلاةٌ في المسجِدِ الحرامِ أفضلُ مِنْ صلاةٍ في مَسْجِدي هذا، بِمَائةِ صلاةٍ)[١] رواه احمد، واتە: نوێژێك لەم مزگەوتەی من بە هەزار نوێژی مزگەوتی ترە، جگە لە مزگەوتی حەرام (کەعبە)، کەنوێژێك لە کەعبە بە سەد نوێژی مزگەوتەکەی منە.

ئەگەر کەسێك نەزری کرد لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ ئیعتیکاف بکات بۆی هەیە نەزرەکەی لە کەعبە بگرێت، چونکە ئەو لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ گەورەترە..

[١] مسند أحمد (٣ / ٣٤٣، ٣٩٧).

## هەندێك باسی جیاواز بە كورتی

- پێم چاكە موسوڵمانان لەگەڵ زانایانی مەككە و مەدینەدا بیكەنە رەمەزان و جەژن. چونكە یەك ئوممەتی زیاتر پێ دەسەلمێت.
- ئەگەر كەسێك شەو نەیزانیبوو سبەینێ رەمەزانەو بۆ بەیانی بیستی، دەبێ خۆی لە خواردن و خواردنەوە بگرێتەوەو واش حساب بكات كە رۆژی یەكەمی رەمەزانەكەی خواردووەو دوایی دەبێت رۆژێك بگرێتەوە.
- ئەگەر لە وولاتێكی رۆژهەڵاتی وەكو مالیزیاو ئەندۆنیسیا بەڕۆژوو بوویت یان لەوولاتێكی رۆژئاوای وەكو وولاتانی ئەوروپا یان ئەمریكا، دوایی گەڕایتەوە كوردستان یان هەر جێیەكی تر، دەبێت رۆژوو جەژنەكەت لەگەڵ دانیشتوانی وولاتی دووەمتدا بكەیت.
- ئەگەر كافرێك لە رەمەزاندا موسوڵمان بوو، هەر ئەو رۆژانەی لەسەر فەرز دەبێت كە ماون، نەك ئەوانەی رابوردن.. قەرزاری رۆژووی كۆنیش نییە.
- ئەگەر ئافرەتێك پێش سپێدەی بەیانی خوێنی حەیز یان نیفاسی وەستابۆوەو پاك بووەوە دەبێت رۆژووی سبەینێی بگرێت، با هێشتا خۆشی نەشتبێت و نوێژی بەیانیەكەشی یان نیوەڕۆو عەسریشی دوا خستبێت.
- ئەگەر ئافرەتێك پێش بەربانگ كەوتە حەیزەوە ـ با بە ٥ دەقیقەش بێت ـ رۆژووەكەی بەتاڵەو بۆی حسێب نابێت، دەبێت دواتر بیگرێتەوە.
- ئەگەر ئافرەتێك وویستی دەرمانێكی وا بە كار بهێنێت كە حەیزەكەی پێ دوا بخات تا لە رۆژوو گرتنە فەرزەكەی و پاداشتەكەی مەحروم نەبێت، بۆی هەیە وا بكات، بەو مەرجەی زیانی تری لێ نەبێتەوە.

- بەکارهێنانی سپرای (بە خخاخ) چ بۆ نەخۆشی رەبووە بێت یان هەر بۆ بۆن خۆش کردنی ناو دەم جائیزە و هیچ ئیشکالی تێدا نییە.
- هەروەها مەعجوونی دان و بەکارهێنانی فڵچەو دان شتن پێیان دوای پارشێو هیچ ئیشکالی نییە، هەروەها دان هەڵکێشانیش.
- هەرکەس نەیزانی چەند قەرزاری رەمەزانەکانی پێشووە، دەبێت تەقدیری بکات، تا دەگاتە ئەو رادە دڵنیاییەی کە ئەوەندیە، ئینجا دەیانگرێتەوە..
- ئەگەر کەسێك بەرۆژوو بوو، لە رۆژی رەمەزانەکەدا خەوت و ئیحتیلام بوو (سلێمانی واتەنی شەیتانی بوو، یان هەولێری واتەنی: شەیتان پێی پێ کەنی) زیان لە رۆژووەکەی ناکەوێت.
- سەرتاشین و نینۆك کردن و قژ چەور کردن و میکیاج کردن و ئەوانە زیانیان بۆ رۆژوو نییە.
- کورد کە دەڵێ: رۆژووەوانی نوێژ نەکەر بەرازی دەم بەستراوە، رەنگە زۆر لە حەقیقەت لایان نەدا بێت، چونکە هەندێك لە زانایانی کۆن و نوێی شەرع ئەو کەسە بە موسوڵمان حسێب ناکەن، با هەر بەردەوام بەرۆژووش بێت.

**تەواو بوو والحمد لله رب العالمين**

# نـــاوەرۆك